٤) درستەیا چوار یدا . هەڤاڵناڤێ چەوایی یێ داریژتی ( بێ بەخت ) ژ پێشگرێ ( بێ ) دگەل پەیڤا ( بەخت ) پێکهاتییە .

٢) درستەیا پێنجێدا . هەڤاڵناڤێ چەوایی یێ داریژتی (هشیار _ هۆشیار ) ژ پەیڤا ( هش _ هۆش ) دگەل پاشگرێ ( یار ) پێکهاتییە .

ج /

دیسان ئەگەر رستەیێن پشکا ( پ ) باش بخوینین دێ بینین پەیڤێن ( دلسۆتی . زك رەش . دلرەق . رووخۆش . سترانبێژ . دەست کورت ) هەمی هەڤاڵناڤن ، لێ ژ لایێ دروست بوونێڤە هەر ئێك ژ وان ژ دوو پەیڤێن واتادار پێکهاتییە . ژ بەر ڤێ چەندێ دبێژنێ هەڤاڵناڤێ لێکدای .

**بۆ پتر روونکرن :-**

١) درستەیا ئێکێدا . هەڤاڵناڤێ چەوایی یێ لێکدای ( دلسۆتی ) ژ دوو پەیڤێن واتادار ) دل (و ) سۆت ( دگەل پاشگرێ ) ی ( پێکهاتییە .

٢) درستەیا دوویێدا . هەڤاڵناڤێ چەوایی یێ لێکدای ( زك رەش ) ژ دوو پەیڤێن واتادار ( زك ) و ( رەش ) پێکهاتییە. هەروەسان هەڤاڵناڤێ چەوایی یێ لێکدای ( دلرەق ) ژ دوو پەیڤێن واتادار ( دل ) و ( رەق ) پێکهاتییە.

٣) درستەیا سێیێدا . هەڤاڵناڤێ چەوایی یێ لێکدای ( رووخۆش ) ژ دوو پەیڤێن واتادار ( روو ) و ( خۆش ) پێکهاتییە .

٤) درستەیا چوارێدا . هەڤاڵناڤێ چەوایی یێ لێکدای ( سترانبێژ ) ژ دوو پەیڤێن واتادار ( ستران ) و ( بێژ ) پێکهاتییە .

٥) درستەیا پێنجێدا . هەڤاڵناڤێ چەوایی یێ لێکدای ( دەست کورت) ژ دوو پەیڤێن واتادار ( دەست ) و ( کورت ) پێکهاتییە .

**دەستوور :**

**هەڤاڵناڤێ چەوایی ژ لایێ دروست بوون و دروست کرنێڤە سێ جۆرە: -**

**أ- هەڤاڵناڤێ سادە : ئەوە کو ژ پەیڤەکا واتادار پێکهاتییە .**

**ب- هەڤاڵناڤێ دارێژتی : ئەوە کو ژ پەیڤەکا سادە یا واتادار دگەل پێشگرەکی یان پاشگرەکی پێکهاتییە .**

**ج- هەڤاڵناڤێ لێکدای : ئەوە کو ژ دوو پەیڤێن سادە یێن واتادار یان پتر پێکهاتییە .**

## ڕاهێنان ( ١ )

دئەڤان ڕستەیێن خوارێدا هەڤاڵناڤێن چەوایی بینە دەرێ ، و جۆرێن وان دیار بکە .

١) باخێ مە یێ جوانە .

٢) مرۆڤێن دەست کورت هەنە .

٣) ئاڤا کانیێ یا زەلاڵە .

٤) مرۆڤێ خراپ هەردەم یێ دلتەنگە .

٥) گولیزار کچەکا بەژن زراڤە .

٦) کارێ نە باش سەرناگریت .

٧) من زەلامەکێ بەژن بلند دیت .

٨) گوندێ وان یێ دوورە .

## ڕاهێنان (٢)

جوداهی دناڤ بەرا هەڤاڵناڤێ دارێژتی و یێ لێکدایدا چییە ؟ ب نموونەڤە دیار بکە .

## ڕاهێنان (٣)

بەرسڤا دروست هەلبژێرە :

١- فرۆکەڤان : (سادەیە- دارێژتی - لێکدایە).

٢- خویندەوار : (سادە- دارێژتی - لێکدایە).

٣- دوو دل : (سادە- دارێژتی - لێکدایە).

٤- نەمر : (سادە- دارێژتی - لێکدایە).

٥- سویر : (سادە- دارێژتی - لێکدایە).

٦- چین چین : (سادە- دارێژتی - لێکدایە).

٧- هویر : (سادە- دارێژتی - لێکدایە).

## ڕاهێنان (٤)

## شرۆڤەکرن

ئەڤان ڕستەیێن خوارێ شرۆڤەبکە : -

١) گەلێ ژێر دەست خەباتێ دکەت .

٢) مە زنجیرا ستویر شکاند .

(وانەیادەهێ)

# پلەیێن هەڤالناڤێ چەوایی

أ /

١) جلكێن جوان بكرە .

٢) ئاڤا كانییێ یا سار بوو .

٣) گولێن مە گەش بوون .

٤) هوینێن تێگەهشتی دێ سەركەڤن .

٥) ئاڤا پاقژ ڤەخو .

ب/

١) شیلان ژ نەرمینێ زیرەكترە .

٢) ئازاد ژ نەوزادی باشترە .

٣) ئەڤ گولە ژ گولادی سۆرترە .

٤) زینێ ژ سولینێ جوانتر بوو .

٥) پەرتووكا من ژ پەرتووكا تە كەڤنتر بوو .

ج/

١) نژیار زیرەكترین قوتابییە دڤێ پۆلێدا .

٢) هەلگورد بلند ترین چیایە ل كوردستانا باشوور .

٣) سالار قوتابییێ هەرە زیرەكێ ڤێ قوتابخانێیە .

٤) دلۆڤان ژ هەمیان مزنترە .

٥) ئازاد ژ گشت قوتابییان باشترە .

٦) نەرمین ژ هەمی خویندكاران هێمنترە .

## بەرچاڤكرن :

أ/

دەمێ سەحا ڕستەیێن پشکا (ئـ ) دکەین ، دێ بینین کو پەیڤێن خیچ ل بندا( جوان ، سار ، گەش ، تێگەهشتی ، پاقژ )  هەمی هەڤاڵناڤێن چەوایی نە ، و هەر ئێك ژ وان ئێکسەر بۆ وەسفا ناڤەکی یا جهناڤەکی بکارهاتییە. و بووینە دیارکەرێن وان .. یان ژی بووینە تەمامکەرێن کارێ بێ هێز ، دڤێرێدا ئەڤ هەڤاڵناڤە دپلەیەکا چەسپایدانە .

ب/

ئەگەر سەحا ڕستەیێن پشکا ( بـ ) بکەین ، دێ بینین پەیڤێن خیچ ل بندا (زیرەکتر . باشتر . سۆرتر . جوانتر . کەڤنتر ) هەمی هەڤاڵناڤێن چەوایی نە. و یێن د پلەیا بەراورد دا چونکو هەر ئێك ژ وان بۆ بەراوردکرنێ دناڤ بەرا دوو ناڤێن وەسف کری دا هاتییە بکارئینان و هەردوو ناڤ دهەڤپشکن دسیفەتیدا . لێ ئێك ژ یێ دی پتر . و ب دانانا نیشانا ( تر ) ل دوماهیا هەڤاڵناڤێ چەوایی هاتییە دروستکرن . و ئامرازێ پەیوەندی ( ژ ) دکەڤیتە دنیڤا هەردوو ناڤاندا .

پ /

دەمێ سەدحکەینە ، ڕستەیێن پشکا ( پ ) دێ بینین پەیڤێن خیچ ل بندا( زیرەکترین . بلندترین . هەرەزیرەك . ژ هەمیان مەزنتر . ژ گشت قوتابییان باشتر . ژ هەمی خوێندکاران هێمنتر )  هەمی هەڤاڵناڤێن چەوایی نە . دپلەیا باڵادانە ، چنکو هەر ئێك ژ وان ئاستێ باڵا یێ ناڤەکی نیشا ددەت ، و دناڤ بەرا ئەوان ناڤێن کو هەمی دهەڤپشکن دسیفەتەکێدا . لێ پلەیا ئێك ژ وان ژ هەمیان پتر و بلندترە ، ب دانانا نیشانا ( ترین )

ل دوماهی هەڤاڵناڤێ چەوایی دهێتە دروستکرن ، و هەر دیسان ئەم دشێین ب رێکا پەیڤا ( هەرە ) یان ( ژ هەمیان ) یان ( ژ گشت ) یان ( ژ هەمی) هەڤاڵناڤێ پلەیا باڵا دروست بکەین کو دکەڤیتە پێشیا هەڤاڵناڤێ پلەیا بەراورد یان یێ چەسپای .

**دەستوور :**

**هەڤاڵناڤێ چەوایی سێ پلە هەنە :**

**أ- هەڤاڵناڤێ پلەیا چەسپای : ئەو هەڤاڵناڤە کو بۆ وەسفا ناڤەکی یان جهناڤەکی دهێتە بکارئینان ، و ناهێتە هەڤبەرکرن دگەل چ ناڤێن دی .**

**ب- هەڤاڵناڤێ بەراورد : ئەو هەڤاڵناڤە یێ کو بۆ هەڤبەرکرنا دناڤ بەرا دوو ناڤێن وەسف کریدا دهێتە بکارئینان . کو هەردوو دهەڤپشکن د سیفەتێدا لێ پلەیا ئێک ژ وان یادی پتر و بلندترە .**

**نیشانا ( تر ) دکەڤیتە دوماهی هەڤاڵناڤێ چەوایی .و ئامرازێ پەیوەندی ( ژ) دکەڤیتە دناڤ بەرا هەر دوو ناڤێن هەڤبەرکریدا.**

**ج- هەڤاڵناڤێ پلەیا باڵا : ئەو هەڤاڵناڤە یە کو ئاستێ باڵا یێ ناڤەکی نیشا ددەت دناڤ بەرا کۆمەکا ناڤێن هەڤپشک دسیفەتەکیدا لێ پلەیا ئێک ژ وان ژ هەمیان پتر و بلندترە . ب دانانا نیشانا ( ترین ) ل سەر دوماهیا هەڤاڵناڤێ چەوایی دهێتە دروستکرن ، هەر وەسان ب رێکا پەیڤا ( هەرە ) کو دکەڤێتە پێشیا هەڤاڵناڤێ چەواییێ چەسپای دهێتە دروستکرن یان ژی ب هاریکاریا پەیڤێن( ژ هەمیان . ژ گشت . ژ هەمی . ژ تەڤ) کو دکەڤنە پێشیا هەڤاڵناڤێ پلەیا بەراورد دهێتە دروست کرن .**

**تێبینی :-** ل بەرامبەر ئامرازێ پەیوەندی ( ژ ) د زارێ کرمانجیا خوارێدا ئامرازێ پەیوەندی ( لە ) ( یە ) .

## ڕاهێنان ( ١ )

بەرسڤا دروست هەلبژێرە:

١–جەهـ ژ گەنمی ئەرزانترە. پلەیا (بالا ، بەراورد ، چەسپای)یە.

٢–نێرگز جوانترین گولا بهارێیە. پلەیا (بالا ، بەراورد ، چەسپای)یە.

٣–ئاڤا کانییێ یا ساربوو. پلەیا (بالا ، بەراورد ، چەسپای)یە.

٤–چیایێ هەلگورد ژ چیایێ سەفین بلندترە. پلەیا (بالا ، چەسپای ، بەراورد)یە.

٥– ئەڤ هەسپە یێ بهێزە. پلەیا ( بەراورد ، بالا ، چەسپای)یە.

## ڕاهێنان ( ٢ )

چەوا هەڤالناڤێ پلەیا بەراورد ژ هەڤالناڤێ پلەیا بالا دێ جودا کەی ؟ ب نموونەڤە ڕوون بکە .

## ڕاهێنان (٣)

ژ ئەڤان دێرێن هۆزانێ هەڤالناڤێ چەوایی بینە دەرێ و پلەیا وان دیار بکە:–

١) سوبە داییێ

پێلاڤا من ژ تاجا میری بلندترە

داوەتا من ژ هەمی گوڤەندا خۆشترە
بەژن و باڵا من ژ بوهارێ ب خەملترە

( موئەید تەیب )

٢) مەڵێ برژانگت تیژە وەك چقڵ
ئەچەقێتە یێ ناسكتر لە گوڵ

( بێسارانی )

٣) جوانتر لە ژین جووتێ چاوە
هەر وەك گۆمی مەنگ وەستاوە

( كامەران موكری )

٤) گەلێك شیرینتر لە خونچەی بەهار
ناسكتر جوانتر لە شەوبۆی بەهار
گەشتر لە دیدەی وەنەوشەی نزار
گوڵێكە ناوی گوڵی سەربەستی
مەردە ئەو گەلەی بگاتە دەستی

( بەختیار زێوەر )

(وانەیایازدێ)

# هەڤاڵناڤێ نیشانە

أ -

١- ئەڤ کوڕە یێ زیرەکە .

٢- ڤی خورتی سەرێ مە بلندکر .

٣- ڤێ کچێ هۆزانەک ڤەهاند .

٤- وی جامێری هاریکارییا مە کر .

٥- وێ گۆتنێ دلێ مە خۆشکر .

٦- ئەڤان مرۆڤان نان خوار .

٧- وان جۆتیاران زەڤیێن خۆ کێلان

٨- ئەو کوڕێ هە چوو .

٩- ئەو کچا هە چوو .

١٠- ئەو کورێن هە چوون .

١١- ئەو کچێن هە چوون .

ب –

١- ئەڤ خانییە یێ جوانە .

٢- ئەم دێیە گەورەیە .

٣- ئەم دێیانە گەورەن .

٤- ئەم خانووە جوانە .

٥- ئەو خانووانە جوانن

**بەرچاڤکرن :**

أ – ئەگەر تەماشەی ڕستەیێن سەری بکەین دێ بینین پەیڤێن ( ئەڤ – ە، ڤی–ێ ، وی – ی ، وێ – ێ ، ئەڤان – ان ، وان – ان ، ئەو – ێهە ، ئەو – اهە ، ئەو – ێنهە ) هەمی هەڤاڵناڤێن نیشانە نە ، چنکی هەر ئێك ژ وان وەسفا ناڤەکی کرییە ، و هاتینە دەستنیشانکرن ، و ژ هەڤ توخمێن خۆ جودا کرینە .

١– دڕستەیا ئێکێدا هەڤاڵناڤێ نیشانە( ئەڤ – ە ) بۆ نێزیك بکار دهێت ، پەیڤا ( کوڕ ) دەستنیشانکرییە و وەکی سیفەتەکێ شیایە ژ ناڤ هەڤتوخمێن خۆ جودا بکەت ، و یێ بوویە دیارکەرێ ناڤێ ( کوڕ ) ی .

٢– دڕستەیا دوویێدا هەڤاڵناڤێ نیشانە ( ڤی – ی ) بۆ ناڤێ نێرێ تاکێ نێزیك بکار دهێت و پەیڤا ( خورت ) دەستنیشانکرییە وەکی سیفەتەکێ شیایە ژ ناڤ هەڤتوخمێن خۆ جودا بکەت و یێ بوویە دیارکەرێ ناڤێ ( خورت ) .

٣– دڕستەیا سێیێدا هەڤاڵناڤێ نیشانە ( ڤێ – ێ ) بۆ ناڤێ مێ یێ تاکێ نێزیك بکار دهێت . پەیڤا (کچ) دەستنیشانکرییە و وەکی سیفەتەتەکێ شیایە ژ ناڤ هەڤتوخمێن خۆ جودا بکەت و یێ بوویە دیارکەرێ ناڤێ (کچ).

٤– د ڕستەیا چوارێدا هەڤاڵناڤێ نیشانە ( وی – ی ) بۆ ناڤێ نێرێ تاکێ دوور بکار دهێت ،پەیڤا ( جامێر ) دەستنیشانکرییە ، وەکی سیفەتەکێ شیایە ژ ناڤ هەڤتوخمێن خۆ جودا بکەت و یێ بوویە دیارکەرێ ناڤێ (جامێر) .

٥- د ڕستەیا پێنجێدا هەڤاڵناڤێ نیشانە ( وێ - ی ) بۆ ناڤێ مێ یی تاكێ دوور بكار دهێت ،پەیڤا ( گۆتن ) دەستنیشانكرییە ، وەكی سیفەتەكێ شیایە ژ ناڤ هەڤتوخمێن خۆ جودا بكەت و یێ بوویە دیاركەرێ ناڤێ (گۆتن).

٦- د ڕستەیا شەشێدا هەڤاڵناڤێ نیشانە ( ڤان - ان ) بۆ ناڤێ نێر و مێ یێ كۆمێ نێزیك بكار دهێت ، پەیڤا ( مرۆڤان ) دەستنیشانكرییە ، وەكی سیفەتەكێ شیایە ژ ناڤ هەڤتوخمێن خۆ جودا بكەت و یێ بوویە دیاركەرێ ناڤێ ( مرۆڤان ) .

٧- د ڕستەیا حەفتێدا هەڤاڵناڤێ نیشانە ( وان - ان ) بۆ ناڤێ نێر و مێ یێ كۆمێ دوور بكار دهێت ،پەیڤا ( جوتیاران ) دەستنیشانكرییە ، وەكی سیفەتەكێ شیایە ژ ناڤ هەڤتوخمێن خۆ جودا بكەت و یێ بوویە دیاركەرێ ناڤێ ( جوتیاران ) .

٨- د ڕستەیا هەشتێدا هەڤاڵناڤێ نیشانە ( ئەو - ێ هە ) بۆ ناڤێ نێرێ تاكێ دوور بكار دهێت و پەیڤا ( كوڕ ) دەستنیشانكرییە ، وەكی سیفەتەكێ شیایە ژ ناڤ هەڤتوخمێن خۆ جودا بكەت و یێ بوویە دیاركەرێ ناڤێ (كوڕ).

٩- د ڕستەیا نەهێدا هەڤاڵناڤێ نیشانە ( ئەو - اهە ) بۆ ناڤێ مێ یێ تاكێ دوور بكار دهێت پەیڤا ( كچ ) دەستنیشانكرییە ، وەكی سیفەتەكێ شیایە ژ ناڤ هەڤتوخمێن خۆ جودا بكەت و یێ بوویە دیاركەرێ ناڤێ ( كچ ) .

– د ڕستەیا دەهێ و یازدێدا هەڤاڵناڤێ نیشانە ( ئەو – ێنهە ) بۆ ناڤێ نێر و مێ یێ کۆمێ دوور بکار دهێت پەیڤا ( کوڕ – کچ ) دەستنیشانکریە، وەکی سیفەتەکێ شیایە ژ ناڤ هەڤتوخمێن خۆ جودا بکەت و یێ بوویە دیارکەرێ ناڤێ ( کوڕ ) و (کچ ) (١)

١– دکرمانجییا خوارێدا ئەڤ هەڤاڵناڤێن نیشانە هەنە :

ئەم ––– ە : بۆ ناڤێ کت و کۆمێ نێزیك:

ئەم گوڵە جوانە .

ئەم گوڵانە جوانن .

ئەو–––ە : بۆ ناڤێ کت و کۆمێ دوور :

ئەو دارە بەرزە .

ئەو دارانە بەرزن .

ب – دڕستەیێن ( ب )دا پەیڤا ( خانی – دێ – خانوو ) سێ ناڤن ، ب پیتا بزوێن ( ی – ێ – وو ) ب دوماهی هاتینە ،هەر وەسا

هەڤاڵناڤێن نیشانە ( ئەڤ – ە ) و ( ئەم – ە ) و ئەو – ە ) ب پیتا بزوێنا (ە) ب دوماهی هاتینە ، بۆ هندێ دوو پیتێن بزوێن لدیڤ ئێکدا نەهێن ، پیتەکا ناڤبەندا گونجای دێ دانینە دناڤبەرا واندا ، پیتا ناڤبەند لدویڤ مەبەستێ دێ بکار ئینین .

( ئەڤ + خانی + ناڤبەندا (یـ ) + ە ) = ئەڤ خانییە

( ئەم + دێ + ناڤبەندا (یـ ) + ە ) = ئەم دێیە

( ئەو + خانوو + ناڤبەندا (و ) + ە ) = ئەو خانوووە = خانووە ، پیتا (و) یا ناڤێ ( خانوو ) دێ لادەین دێ بیتە ( خانو )

**دەستوور :**

**هەڤاڵناڤێ نیشانە** : ئەو هەڤاڵناڤە کو وەسفا ناڤەکی دکەت ، و ب ساناهی ژ هەڤتوخمێن خۆ جودا دکەت ، و هەردەم ناڤێ دەستنیشانکری دکەڤیتە دناڤبەرا هەر دوو بەشێن هەڤاڵناڤیدا .

**ژ هەڤاڵناڤێن نیشانە د زمانێ کوردیدا .**

١- ئەڤ – ە . ٢ – ڤی – ی . ٣- ڤێ – ێ . ٤- وی – ی .

٥- وێ – یٚ . ٦- ئەڤان – ان . ٧- وان – ان . ٨- ئەو - ێهە.

٩- ئەو – اهە . ١٠- ئەو – ێنهە. ١١- ئەم – ە . ١٢- ئەو – ە .



## ڕاهێنان ( ١ )

**نموونە :**

١- زارۆك ( هەژار ) :

ئەڤ زارۆکە یێ هەژارە .

٢- تری ( شرین ) :

ئەڤ تریيە گەلەکێ شرینە .

ئەڤێن ل خوارێ دگەل هەڤاڵناڤێ نیشانە دڕستەیاندا بکار بهێنە .

پەنیر ( جوان ) ، دەرگەهـ ( پان ) ، ئاڤ ( سار ) .

دەریا ( کویر ) ، ئاگر ( خۆش ) ، دار ( بلند ) ، بەڕی ( شرین ) .

زەلام ( ئازا ) ، کەو ( گەردەن ب خال ) .

## ڕاهێنان ( ٢ )

دڤان ڕستەیێن خوارێدا هەڤاڵناڤێ نیشانە بینەدەر:-

١- ئەڤان راپۆرتان بخوینە .

٢- ڤێ دەفتەرێ بکڕە .

٣- ئەم نەمامە بچێنە .

٤- وی هەڤالێ هە فراڤێن خوار .

٥- وی جوتیارێ هە زەڤیا خۆ کێلا .

## ڕاهێنان ( ٣ )

ڤان هەڤاڵناڤێن نیشانەیێن خوارێ دڕستەییێدا بکار بهێنە :

( وان – ان ) ، ( ئەڤان – ان ) ، وێ – ێ ) ، ئەم – ە ) ، ( ئەو – ێنهە)

## ڕاهێنان ( ٤ )

ئەڤان ڕستەیێن خوارێ شرۆڤە بکە :

١– ڤێ چیرۆکێ بخوینە .

٢– ئەو خانووە خۆشە .

٣– وێ کابانییێ مالەکا مەزن برێڤە بر .

٤– ئەم مەڕانە دەفرۆشم .

( وانەیادوازدێ )

# جهناڤێ نیشانە

١- ئەڤە هەڤالێ منە .

٢- ڤی نان خوارییە .

٣- ڤێ نان خوارییە .

٤- وی چیرۆك گۆت .

٥- وێ چیرۆك گۆت .

٦- ئەڤان ( ڤان ) گۆ ڤەندەكا خۆش گرێدا .

٧- وان ( ئەوان ) رەشبەلەك گرێدا .

٨- ئەوێهە ( وێهە ) كارێ خۆ كر .

٩- ئەواهە ( واهە ) گازی كر .

١٠- ئەوێنهە ( وێنهە ) هەمی كرێكارن .

## بەرچاڤكرن :

دەمێ ئەم بنێرینە رستەیێن سەری دێ بینین پەیڤێن : (ئەڤە - ڤی - ڤێ - وی - وێ - ئەڤان(ڤان) - ئەوان(وان) - ئەوێهە - ئەواهە - ئەوێنهە ) (١) هەمی جهناڤێن نیشانە نە ، چونكی هەر ئێك ژ وان جهێ ناڤەكی گرتییە و ل شوینا وی ناڤی بكار هاتییە و دەستنیشانكرییە .

١- دڕستەیا ئێکێدا جهناڤێ نیشانە ( ئەڤە ) بۆ تاکێ نێزیك بکار هاتییە، جهێ ناڤەکی گرتییە و دەستنیشانکرییە

٢- دڕستەیا دوویێدا جهناڤێ نیشانە ( ڤی ) بۆ نێرێ تاکێ نێزیك بکار هاتییە، جهێ ناڤەکی گرتییە و دەستنیشانکرییە .

٣- دڕستەیا سێیێدا جهناڤێ نیشانە ( ڤێ ) بۆ مێیا تاکێ نێزیك بکار هاتییە، جهێ ناڤەکی گرتییە و دەستنیشانکرییە .

٤- دڕستەیا چوارێدا جهناڤێ نیشانە ( وی ) بۆ نێرێ تاکێ دوور بکار هاتییە ، جهێ ناڤەکی گرتییە و دەستنیشانکرییە .

٥- دڕستەیا پێنجێدا جهناڤێ نیشانە ( وێ ) بۆ مێیا تاکێ دوور بکار هاتییە، جهێ ناڤەکی گرتییە و دەستنیشانکرییە .

٦- دڕستەیا شەشێدا جهناڤێ نیشانە ( ئەڤان - ڤان )(٢) بۆ نێر و مێ یێن کۆمێ نێزیك بکار هاتییە ، جهێ چەند ناڤان گرتییە و دەستنیشانکرینە.

٧- دڕستەیا حەفتێدا جهناڤێ نیشانە ( ئەوان - وان ) بۆ نێر و مێ یێن کۆمێ دوور بکار هاتییە ، جهێ چەند ناڤان گرتییە و دەستنیشانکرینە.

٨- دڕستەیا هەشتێدا جهناڤێ نیشانە ( ئەوێهە - وێهە ) بۆ نێرێ تاکێ دوور بکار هاتییە ، جهێ ناڤەکی گرتییە و دەستنیشانکرییە .

٩- دڕستەیا نەهێدا جهناڤێ نیشانە ( ئەواهە - واهە ) بۆ مێیا تاکێ دوور بکار هاتییە ، جهێ ناڤەکی گرتییە و دەستنیشانکرییە .

١٠- دڕستەیا دەهێدا جهناڤێ نیشانە ( ئەوێنهە - وێنهە)[٣] بۆ نێر و مێ یێن کۆمێ دوور بکار هاتییە ، جهێ چەند ناڤان گرتییە و دەستنیشانکرینە.

## دەستوور :

**جهناڤێ نیشانە پەیڤەکە جهێ ناڤەکی دگریت ، و ل شوینا وی ناڤی بکار دهێت و دەستنیشان دکەت .**

**( ئەڤە ، ڤی ، ڤێ ، وی ، وێ ،( ئەڤان - ڤان ) ، ( ئەوان - وان ) ،ئەوێهە ، ئەواهە، ئەوێنهە ، ئەمە ، ئەوە ، ئەمانە ، ئەوانە )**




(١) - دکرمانجییا خوارێدا جهناڤێن نیشانە ئەڤەنە :
١- ئەمە : بۆ نێر و مێ یێ کتێ نێزیك بکار دهێت .
ئەمە بنووسەوە .
٢- ئەوە : بۆ نێر و مێ یێ کتێ دوور بکار دهێت .
ئەوە زیرەکە .
٣- ئەمانە : بۆ کۆمێ ( نێر و مێ ) نێزیك بکار دهێت .
ئەمانە دڵسوزانە کار دەکەن .
٤- ئەوانە : بۆ کۆمێ ( نێر و مێ ) دوور بکار دهێت .
ئەوانە دەناسم .
(٢) هندەك ( ئەڤانە - ئەڤانا ) بکار دهێنن .
(٣) هندەك ( ئەوانێنهە - وانێنهە ) بکار دهێنن .

## ڕاهێنان ( ١ )

د ڤان ڕستەیێن خوارێدا جهناڤێن نیشانە بینەدەر :

١ – ئەڤە مامۆستایێ مەیە .

٢ – ڤی نڤیسییە .

٣ – ئەوە هەلدە بژێرم .

٤ – ڤان زەڤیێن خۆ کێلان .

٥ – ئەوێهە هات .

٦ – ئەوانە زیرەکن .

## ڕاهێنان ( ٢ )

بەرسڤا دروست هەلبژێرە:

١ – ئەڤ زەڤییە ببەرهەمە. (جهناڤێ نیشانەیە ، هەڤالناڤێ نیشانەیە ، جهناڤێ جودایە).

٢ – ئەڤە چیایێ گارەیە. (جهناڤێ نیشانەیە ، هەڤالناڤێ نیشانەیە ، جهناڤێ جودایە).

٣ –ئەوبەرەڤانییێ ژئاخاخۆ دکەت. (جهناڤێ نیشانەیە، هەڤالناڤێ نیشانەیە، جهناڤێ جودایە).

٤ – ئەڤە بەرەبایێن پاشەڕۆژێنە . (جهناڤێ نیشانەیە ، هەڤالناڤێ نیشانەیە ، جهناڤێ جودایە).

٥ – ئەڤ خورتەیێ چەلەنگە. (جهناڤێ نیشانەیە ، هەڤالناڤێ نیشانەیە ، جهناڤێ جودایە).

## ڕاهێنان ( ٣ )

شەش ڕستەیان بینە کو جهناڤێ نیشانە تێدابیت ، سێ بۆ نێزیك و سێ بۆ دوور بن .

## ڕاهێنان ( ٤ )

ئەڤان ڕستەیێن خوارێ شرۆڤەبکە :

١- ڤی گەنم چاندییە .

٢- ئەڤان ستران گۆتن .

٣- ئەمە هات بۆ قوتابخانە .

( وانەیاسێزدێ )

# جیاوازییا

## هەڤالناڤێ نیشانە و جهناڤێ نیشانە

أ –

١- ئەڤ رەزە یێ مەیە .

٢- ئەم گوندە خۆشە .

٣- ڤێ زەڤیێ بەرهەمەکێ باش ژێهات .

٤- ئەڤان گولان بچینە .

٥- وی رەزڤانی رەزێ خۆ فرۆشت .

٦- ڤی شڤانی پەز باش چەراند

٧- وێ پەرتووکا هە بینە .

ب –

١- ئەڤە شڤێدی هاتبوو مالا مە .

٢- ئەمە پەرتووکەکەی هێنا .

٣- ڤی گول چاندن .

٤- ڤێ کراسەک کڕی .

٥- وێهە گەلەک خەباتا کری .

٦- ئەڤان پارە وەرگرتن .

٧- وان فراڤین خوار بوو .

## بەرچاڤكرن :

أ– بەری نهۆ مەزانی هەڤاڵناڤێ نیشانه پەیڤەكه ناڤەكی دەستنیشان دكەت ، و وەكی سیفەتەكێ دبیته دیاركەرێ وی ناڤی .

ئەگەر بەرێ خوٚ بدینە ڕستەیێن پشكا ( أ ) دێ بینین  هەڤاڵناڤێن نیشانه ( ئەڤ – ە ، ئەم – ە ، ڤێ – ێ ، ئەڤان – ان ، وی – ی ، ڤی – ی ، وێ – هە ) هەر ئێك ژ وان ناڤەكێ دەستنیشانكری و یێ بوویە دیاركەرێ وی ناڤی .

ناڤێ دیاركری (دەستنیشانكری ) كەتییە د ناڤبەرا هەردوو پارچێن هەڤاڵناڤیدا.

ب – بەری نهۆ مەزانی جهناڤێ نیشانه ، پەیڤەكه جهێ ناڤەكی دگریت و وی ناڤی دەستنیشان دكەت ڤێجا ئەگەر سەحكەینە ڕستەیێن پشكا ( ب ) دێ بینین جهناڤێن نیشانه ( ئەڤە – ئەمە – ڤی – ڤێ – وێهە – ئەڤان – وان) هەر ئێك ژ وان جهێ ناڤەكی گرتییە و ل شوینا وی ناڤی بكار هاتییە و یێ دەستنیشان كری .

## دەستوور :

**ژێك جوداكرنا هەڤاڵناڤێ نیشانە و جهناڤێ نیشانە دێ بڤی شێوەی بیت :**

**١- هەڤاڵناڤێ نیشانە پەیڤەكە دوو پارچەیە ، ناڤەك دكەڤیتە دناڤبەرا وان هەردوو پارچاندا ، بەلێ جهناڤێ نیشانە پەیڤەكە و ئێك پارچەیە و جهێ ناڤی دگریت .**

**٢- ناڤێ دەستنیشانکری ل هەڤاڵناڤێ نیشانه دهێته بەحسکرن ، و دکەڤیته دناڤبەرا هەردوو پارچێن ویدا ، بەلێ د جهناڤی نیشانەدا ناڤێ دەستنیشانکری ناهێته بەحسکرن .**

**٣- هەڤاڵناڤێ نیشانه ل رەخ ناڤەکی دهێت ، و دبیته دیارکەرێ وی ناڤی ، بەلێ جهناڤێ نیشانه جهێ ناڤەکی دگریت ، و ل شوینا وی بکار دهێت .**

## ڕاهێنان ( ١ )

دڤان ڕستەیێن خوارێدا پەیڤێن نیشانه هەنه ، کیژ وان هەڤاڵناڤێ نیشانەیه و کیژ وان جهناڤێ نیشانه یه ؟ بینەدەر .

١- ئەڤە وارێ مەیه .

٢- ئەم گوڤارە بخوینەوە .

٣- ڤی خەباتکەری خەلات بکە .

٤- کەنگی ئەوێهە هات ؟

٥- ڤان شڤانان پەزێ خۆ ئاڤدا .

٦- کولیلکێن ناڤ وان رەزان ، جوانن .

٧- ڤی زەڤی فرۆشتییه .

٨- ئەوێنهە کارێ خۆ تەمامکر .

## ڕاهێنان ( ٢ )

ئەڤان پەیڤان دڕستەییێدا بکاربینە ب مەرجەکی جارەکێ (هەڤاڵناڤێ نیشانە) و جارەکێ (جهناڤێ نیشانە ) بن .

( وی – وان – ڤان – وێ – ڤی )

## ڕاهێنان ( ٣ )

ئەڤان ڕستەیین خوارێ شرۆڤەبکە :

١– وێ نامەیێ بنڤیسە .

٢– ئەڤان چیرۆکنڤیسان چیرۆك نڤیسین .

٣– ئەڤە گوندێ مەیە .

٤– ئەوانە بۆ من بینە .

## ڕاهێنان ( ٤ )

دێ چەوا هەڤاڵناڤێ نیشانە ژ جهناڤێ نیشانە جوداکەین ؟ ب نموونە روون بکە .

( وانەیاچواردێ )

# هەڤاڵکار

١- دوهی بەفر باری .

٢- رامان بلەز چوو .

٣- ئازادی کەو دناڤ هێلینێدا گرت .

٤- پووشەکە تۆزێ سووتا .

## بەرچاڤکرن :

ئەگەر بەرێخۆبدەینە رستەیێن سەری و باش هزرا خۆ د کارێن واندا بکەین دێ بینین :

١- درستەیا ئێکیدا ئەم دشیاین ببێژین ( بەفر باری ) ، لێ بۆ هندێ سنوورەکی ( توخیبەکی ) بۆ دەمێ روودانا کارێ رستەیێ دانێین ، مە هەڤالکارێ ( دوهی ) بکارئینایە ، و ب هاریکاریا وێ ئەم شیاین دەمێ روودانا وی کاری و رامانا وی ژی ب تەمامی ئاشکرا بکەین .

٢- درستەیا دوویێدا مەڤیا چەوایا تەمامبوونێ دەربێخین ژ بەر هندێ مە هەڤالکارێ (بلەز) بکارهێنا، ومە سنۆرەك بۆ چەوانییا واتا کارێ (چوو) دانایە.

٣- درستەیا سێیێدا مە ڤیا جهێ روودانا کاری کو ( گرت )ە نیشان بدەین، ژ بەر هندێ مە هەڤاڵکارێ ( دناڤ هێلینێ ) دا بکار هێنایە ، بهاریکاریا وی هەڤالکارێ مە سنوورەك بۆ واتا کاری دانا ، و مەزانی کو ئازادی کەو دناڤ هێلینێدا گرتییە .

٤- درستەیا چواریێدا پەیڤا مە ڤیا چەندایەتیا ڕوودانا کارێ (سووتا) نیشا بدەین، هەڤاڵکارێ چەندییە ، چونکە ئەندازێ سووتنا وی پیشی  بۆ مە درئێخستییە ، ئەگەر ئەڤ پەیڤە درستەییێدا نەبووایە ، مە نەدزانی ئەو پیش چەند سووتییە، ژ بەر هندێ دبێژنە ڤێ پەیڤێ ( تۆزێ ) هەڤاڵکارێ چەندی.

## دەستوور :

**هەڤاڵکار : پەیڤەکە ڕوویەکێ روودانا کارێ ڕستەیێ دەربارێ ( دەمێ وێ روودانێ ، یان جهێ روودانێ یان چەواییا روودانێ یان چەندیێ ) دەردئێخیت، و ژ ڤی لایڤە سنوورەکی بۆ تەمامکرنا واتا وێ ( ڕاماناوێ ) دادنیت .**

(وانەیاپازدێ)

# جۆرێن هەڤاڵکاری

## ١/هەڤاڵکارێ دەمی

١- دوهی ئەزموونێن مە بدوماهی هاتن .

٢- ساڵەکا دی ڤینوار دێ چیتە زانکۆیێ .

٣- ئەمشەو نامەیەک بۆ رزگار دەنووسم .

٤- ئەڤرۆ گەلێن جیهانێ بۆ ئاشتیێ خەباتێ دکەن .

٥- ئەوان ئێستا نانەکەیان دەخۆن .

٦- بەری نهۆ ئەز ل گوندی بووم .

٧- رۆژا ئەینی دێ چینە سەیرانێ .

٨- نیوار درەنگ گەهشت .

## ٢/ هەڤاڵکارێ جهی

١- کاوە ل بن دارێ دخوینیت .

٢- منداڵەکە لە سەربان نوست .

٣- ئازاد ل تەنشت من راوەستابوو .

٤- مەلەڤان دناڤ ئاڤێدا بوو .

٥- ئەم ژ دوور هاتبووین .

## ٣/ هەڤاڵکارێ چەوایی

١- وێ چیرۆک خۆش گۆت .

٢- نازدار بلەز چوو ماڵ .

٣- مامۆستا بەپێکەنینەوە هاتە ژوورەوە .

٤- فراڤینێ ب گەرمی بخۆ .

٥- بەفر ل کوردستانێ گەلەک دباریت .

٦- جوتیاری فیقیێ خۆ ب ئەرزانی فرۆشت .

٧- پێشمەرگەکان شێرانە بەرگری لە کوردستان دەکەن .

**بەرچاڤكرن :**

١- دڕستەيێن پشكا ( ١ ) دا هەڤاڵكارێن ( دوهی ، ساڵەكادی ، ئەمشەوە ، ئەڤرۆ ، ئێستا ، بەری نهۆ ، رۆژا ئەينی ، درەنگ ) هەر ئێك ژ وان سنوورەكی بۆ دەمێ ڕوودانا كارێ خۆ دادنيت، و ژ ڤی لايڤە دبنە تەمامكەرێ وان كاران. ڤيجا ب وێ پەيڤا كو دەمێ روودانا كارێ ڕستەيێ دەردئێخيت و واتايا وێ ژی تەمام دكەت دبێژنێ ( هەڤاڵكارێ دەمی ) .

٢- دڕستەيێن پشكا ( ٢ ) دا هەڤاڵكارێن ( ل بن دارێ ، لە سەربان ،ل تەنشت، دناڤ ئاڤێدا ، ژ دوور ) هەر ئێك ژ وان سنوورەكی بۆ جهێ ڕوودانا واتايا كاری دادنيت و ژ ڤی لايڤە دبنە تەمامكەرێ وان كاران ڤێجا ئەو پەيڤا جهێ روودانا كارێ ڕستەيێ دەر دئێخيت و واتايا وێ ژی تەمام دكەت دبێژنێ ( هەڤاڵكارێ جهی ) .

٣- دڕستەيێن پشكا ( ٣ ) دا هەڤاڵكارێن ( خۆش ، بلەز ، بە پێكەنينەوە، ب گەرمی ، گەلەك ، ب ئەرزانی ، شێرانە ) هەر ئێك ژ وان سنوورەكی بۆ چەوايیا ڕوودانا واتايا كاری دادنيت و ژ ڤی لايڤە دبنە تەمامكەرێ وان كاران ، ڤێجا ئەو پەيڤا چەوايیا روودانا كارێ ڕستەيێ دەردئێخيت ، و واتايا وێ ژی تەمام دكەت ، دبێژنێ ( هەڤاڵكارێ چەوايی ) .

## دەستوور :

١- هەڤاڵکارێ دەمی : پەیڤەکە یان چەند پەیڤەکن ، دەمێ روودانا کارێ رستەیێ دەردئێخیت ، و دبیتە تەمامکەرێ وی کاری .

بۆ نموونە ، ئەڤە هەڤاڵکارێن کاتینە : ( دوهی ، پێر ، رۆژی هەینی ، هەیڤا گولانێ ، نهۆ ، ئەڤساڵە ......)

٢- هەڤاڵکارێ جهی : پەیڤەکە یان چەند پەیڤەکن ، جهێ روودانا کارێ رستەیێ دەردئێخیت ، و دبیتە تەمامکەرێ وی کاری .

بۆ نموونە ، ئەڤە هەڤاڵکارێن جهینە : ( تەنشت ، لژێر ، بەردەم ، راست ، چەپ ، لسەر ..........)

٣- هەڤاڵکارێ چەوایی : پەیڤەکە یان چەند پەیڤەکن چەواییا روودانا کارێ رستەیێ دەردئێخیت ، و دبیتە تەمامکەرێ وی کاری .

بۆ نموونە . ئەڤە هەڤاڵکارێن چەوایینە : ( خێرا ، بلەز ، هێدی ، توند ، ل سەر خۆ ، بـ باشی ، بـ گەرمی ........)

## ڕاهێنان ( ١ )

دڕستەیێن خوارێدا هەڤاڵکارێ ( دەمی ، جهی ، چەوایی ) دیار بکە :

١- ژمێژە مللەتێ کورد دژی داگیر کەری ڕاوەستایە .

٢- خوناڤ ب سەرفەرازی ژ ئەزموونێ دەرباز بوو .

٣- ل هاڤینێ پتریا خەلکی ل سەربانی دنڤن .

٤- ڕۆژانی هەینی دەچن بۆ سەیران .

٥- دوهی هاتمە ماڵا هەوە ، تۆل ماڵ نەبووی .

٦- ئەڤرۆ دڤێت کوردستان ژ هەمی لایانڤە پێش بکەڤێت .

٧- باران زۆر باری .

٨- پەرتووکەکەم لە ناو جانتاکەدا دانا .

٩- پار چووبووم بۆ هەڤلێرێ .

١٠- ئیستا دەچم بۆ بازاڕ .

١١- گەلێ کوردستانێ ل پێنجی ئادارێ شێرانە ڕاپەڕی .

## ڕاهێنان ( ٢ )

ئەڤان ڤالاییێن خوارێ ب هەڤاڵکارەکی پڕ بکە :

١- ل ................ شارێ بەغدا ب ................. سەعەتێ ڕێك ب ترومبێلێ دێ گەهینە بازێڕێ بابل ، ئەو بازێڕێ پێنج هەزار ساڵا ................ هاتییە دروستکرن ، پاشایێ وی بازێڕی ................ ژ دایکبوونا عیسای ب هەڤدە چەرخا پەیرەوەکێ ڕێك و پێك دانایە ، ................ حەمۆرابیدا ، بابل خودان هێز و دەسهەلاتەکێ مەزن بوویە.

## ڕاهێنان ( ٣ )

بەرسڤا دروست هەلبژێرە :

١- دێ کوردستانێ ژ دل پارێزین.هەڤالکارێ (جهی-دەمی-چەوایی)یە.

٢- گوند ل سەرێ گری بوو. هەڤالکارێ (جهی-دەمی-چەوایی)یە.

٣- بەرێ سپێدێ دیکل بانگ ددەت.هەڤالکارێ (جهی-دەمی-چەوایی)یە.

٤- ژ نهۆ پێڤە کارێ خراپ ناکەین. هەڤالکارێ (جهی-دەمی-چەوایی)یە.

٥- ب جوانی بەرسڤێ بدە. هەڤالکارێ (جهی-دەمی-چەوایی)یە.

٦- کیسەلە هێدی ب رێڤەدچیت.هەڤالکارێ (جهی-دەمی-چەوایی)یە.

## ڕاهێنان ( ٤ )

١- من رۆژنامە بلەز خواند

من : جهناڤێ کەسی سەربەخویە بۆ کەسێ ئێکێ یێ تاك - بکەرە

رۆژنامە : ناڤە - تاکە - گشتییە - نەناسیارە - بەرکارە .

بلەز : هەڤاڵکارێ چەواییە ، تەمامکەرێ کارێ ڕستەیێ یە .

خواند : کارێ بۆریێ نێزیکێ تێپەڕە .

٢- ئەڤان ڕستەیێن خوارێ شرۆڤە بکە :

أ- گەلێ کوردستانێ ل پێنجێ ئادارێ شێرانە راپەڕی .

ب - دوێنێ چووم بۆ ماڵی ئازاد .

(وانەیا شازدێ)

# گرێیا ناڤی

ڤان ڕستەیان بخوینە :

١- من چرایێ ژوورا خۆ ڤەمراند . ( بەرکارە )

٢- چرایێ ژوورامە یێ گەشە . (نیهادە )

٣- چرایێ ژوورێ یێ هەلبووی . (بکەرە )

٤- ڕووناهییا مە ژ چرایێ ژوورێڤە دهێت . (تەمامکەرێ بەیاریدەیە )

٥- چرایێ ژوورا ئازادی ئەڤ جهە ڕوونکرییەڤە . ( بناڤی هاتییە تەمامکرن)

٦- ئەڤە ڕوناهییا چرایێ ژوورێیە . ( تەمامکەرێ کارێ بێهێزە)

٧- کەوێ ڕبادی یێ دەنگ خۆشە . ( نیهادە )

٨- دارا گویزێ زۆر ئاڤ دڤێت . ( بکەرە )

٩- ئاگر ژ دەهمەنا مرۆڤی بەر دبیتە مرۆڤی . ( تەمامکەرێ بەیاریدەیە )

١٠- دەلنگێن شەلێ میرزای دگورجن . ( تەمامکەرێ ناڤییە )

١١- لومەکرن دەرازینکا دەرێ یە . ( تەمامکەرێ کارێ بێهێزە )

١٢- ڕۆناهییا چرایێ ژوورێ کێم بوو . ( تەمامکەرێ ناڤییە )

## بەرچاڤکرن :

دخواندنا سالێن بۆریدا مە زانییە کو هەر کۆمەڵە پەیڤەك ، ئەگەر ب سەر ئێکڤە بن و کار دگەلدا نەبیت ، مەبەست و ڕامانەکا تەمام نەدەتە دەست، دبێژنێ ( گرێ ) ، ئەڤجا ئەگەر بنێڕینە ڕستەیێن سەری دێ بینین :

أ – دڕستەیا ئێکێدا گرێیا تەمامکری (چرایێ ژوورا خۆ) کەفتیە بەر کاریگەریا کارێ تێپەڕ ( ڤەمراند ) و بوویە بەرکار ، ئەو گرێ وەکی ناڤەکێ ئاسایی کاردکەت ، لەوا دبێژنێ ( گرێیا ناڤی ) . ژ بەر هندێ ژ کۆمەکا پەیڤان ب سەرئێکڤە پێکهاتییە و ئێك ژ ئەرکێن ناڤی دیتییە کو ( بەرکار )٥ .

ب – هەر ب وی شێوەی دڕستەیا دوویێدا هەر ئەو گرێیا تەمامکری (چرایێ ژوورا مە ) ئەرکەکێ دی یێ دایێ وەکی ناڤەکێ ئاسایی کارێ خۆ دڕستەیێدا دیتییە کو ( نیهاد ) ٥ . هەر ب ڤی ئاوایی دڕستەیا حەفتێدا گرێیا ( کەوێ رباد ) ژی ئەرکێ ( نیهاد ) ی دیتییە .

ج – دڕستەیا سێیێدا ( چرایێ ژوورێ ) و دڕستەیا هەشتێدا (دارا گویزێ) گرێیەکا تەمامکرییە ، وەکی هەر ناڤەکێ ئاسایی ئەرکێ ( بکەر ) دیتییە ، لەورا دبێژنێ (( گرێیا ناڤی )) .

د – هەر بڤی ئاوایی دڕستەیێن ( چوارێ و پێنجێ و شەشێ ) دا گرێیا تەمامکری ( چرایێ ژوورێ ) دهەر ڕستەیەکێ ژ ڤان ڕستەیان ئەرکەکێ جودا ب خوڤە دیتییە . دڕستەیا چوارێدا بوویە تەمامکەرێ بەیاریدە و دڕستەیا پێنجێدا ژی هاتییە تەمامکرن ب ناڤەکی ، و دڕستەیا شەشێدا ژی بوویە تەمامکرێ کارێ نەتەمام ، دیارە ئەڤ هەرسێ ئەرکەژی ، هەر ئەرکێ ناڤینە لەوا دبنە ( گرێیا ناڤی ) .

هەر بڤی ئاوایی گرێیێن : (دەهمەنا مرۆڤی) تەمامکەری بەیاریدەیە و (دەلنگێن شەلی) هاتییە تەمامکرن بناڤەکی و (دەرازینکا دەری )

تەمامکەرێ کارێ بهێزە ، دڕستەیا دوازدێدا ژی گرێیا ( چرایێ ژوورێ ) دبیتە تەمامکەرێ ناڤێ ( ڕووناهی ) .

**دەستوور :**

**گرێیا ناڤی : کۆمەڵەکا پەیڤانە ب سەر ئێکڤە پەیوەندییەکا بهێز دگەل ئێکدا هەیە ، و هەمی ئەرکێن ناڤی دبینیت . هەر ژ بەر ڤێ چەندێ دبێژنێ ( گرێیا ناڤی ) .**

**ژ لایێ دروستبوونێڤە ژی ، تەمامکری و لێکدایی هەیە کو بڤی شێوەی دروست دبن :**

**١- ژ دوو ناڤێن ( سادە و نەسادە ) کو دکەڤنە پال ئێک ب هاریکارییا ئامرازێ دانەپاڵ دبنە گرێیا ناڤێ تەمامکری ، وەکی :**

**(گولا باخی ، دارا هنارێ ، گورێ گوندی ، گۆپاڵێ گاڤانی) .**

**٢- ژ ناڤەکی و هەڤاڵناڤەکێ سادە یان نەسادە کو ب هاریکارییا ئامرازێ دانەپاڵ دکەڤنە پاڵ ئێک و دبنە گرێیا ناڤی یا لێکدای وەکی :**

**( پەڕۆکێ کەڤن ، سێڤا تام خۆش ، چیایێ بلند ، ئاڤا ڕەنگ شێلی ) .**

**٣- ژ دوو پەیڤێن واتا دار کو ب هاریکارییا ئامرازێ دانە پاڵ و ئامرازێ ( ب ) و ( بێ ) بهێنە لێکدان ؟،دوی دەمیدا دبنە گرێیا ناڤی یا لێکدای ، وەکی : ( مرۆڤێ ب هێز ، پێشمەرگەیێ ب جەرگ ، تێشتا ب تام ، دارا بێ بەر).**

## ڕاهێنان ( ١ )

دڤێ پارچەیێدا گرێیێن ناڤی بینە دەر :

شەڤا زڤستانێ نەخۆشترین دەم بوو لنك ڤێ دایكا هەژار ، ئەو و زارۆكەكێ ساڤا د هەمبێزا شەڤەكا ب تنێدا ، ل دەستپێكا شەڤێ هەتا بەرێ سپێدێ ، ئەگەر بۆ دەمەكێ كێم ژی خەو چووبا چاڤێن وێ ، دا خەونا ب گوندێ وێرانكری یان ب چیایێن بلند و بەفرا زۆزانان و گولێن باخچەیڤە بینیت .

## ڕاهێنان ( ٢ )

دڤان ڕستەیاندا گرێیێن ناڤی دەست نیشان بكە : –

١– قوتابیێ زیرەك یێ خۆشتڤییە .

٢– تەختێ ڕەش دەستێن مە پیس دكەت .

٣– ئەوان خانیێ خۆ یێ خۆش فرۆشت .

٤– ترییێ هشك یێ نەخۆشە .

٥– كەوێ زۆزانان دناڤ بەفرێژیدا دژیت .

## ڕاهێنان ( ٣ )

ڤان ڤالایان ب گرێیەكا ناڤی پڕبكە : –

١–............... یا ب ترسە .

٢–............... نەخوار یەڤە .

٣– من نامەك بۆ ............... ڕەوانەكر .

٤– ............... ژ چ تۆڕە نابینە ڤە .

٥– ............... دەرچوویێ ئێكێ یە .

( وانەیاهەڤدێ )

# گرێیا هەڤاڵناڤی

## ڤان ڕستەیان بخوینە :

١- برایێ من وێنەیەکێ ڕەنگا و ڕەنگ چێکر .

٢- ئەڤ کوڕێ دار بدەست پسمامێ لزگینییە .

٣- خیارێ کولیلک پێڤە یێ نازکە .

٤- کوردستانێ پێدڤی ب گەنجێ نوی پێگەهشتی هەیە .

٥- مرۆڤێ خۆفرۆش دوژمنێ میللەتێ خۆیە .

٦- زاڕۆکێ دەست درێژ کارێن خراپ دکەت .

٧- کابرایێ دلسۆز خۆشتڤییە .

## بەرچاڤکرن :

پشتی خواندنا ڕستەیێن سەری دێ بینین : –

١– درستەیا ئێکێدا پشتی ناڤێ ( وێنەیەك ) کۆمەڵە پەیڤەك بکار هاتینە کو پێکڤە وەسفا ناڤەکی دکەن ، ئەو ژی پەیڤێن ( ڕەنگا و ڕەنگ ) ن ، کو وەکی گرێیا هەڤاڵناڤی بکارهاتییە ، ئەڤ پەیڤە گرێیە ، چونکی ژ کۆمەڵە پەیڤەکا پێکهاتییە و هەڤاڵناڤە ژی ، چونکی وەسفا ناڤەکی دکەت ، لەورا دبێژنێ ( گرێیا هەڤاڵناڤی ) .

٢- هەر وەسا دڕستەیا دوویێدا ، پشتی ناڤێ ( کوڕ ) کۆمەڵە پەیڤێن ( دار بدەست ) دهێت کو وەکی گرێیەکێ وەسفا ناڤێ ( کوڕ ) دکەت ، لەورا ئەوژی دبیتە ( گرێیا هەڤاڵناڤی ) .

٣- دڕستەیا سێیێدا ناڤێ ( خیار ) بکۆمەڵە پەیڤێن ( کولیلک پێڤە ) هاتییە وەسفکرن و ئەڤ کۆمەڵە پەیڤە بوویە ( گرێیا هەڤاڵناڤی ) .

٤- دڕستەیا چوارێ ژیدا ، هەر بڤی ئاوای گرێیا ( نوی پێگەهشتی ) وەسفا ناڤێ ( گەنج ) دکەت و دبیتە تەمامکەرێ وی ژی ، کو گرییەکا هەڤاڵناڤییە.

٥- ئەڤجا هەر بڤی ئاوای دڕستەیا پێنجێدا ، کۆمەڵە پەیڤێن ( خۆ فرۆش)، دڕستەیا شەشێدا پەیڤێن ( دەست درێژ ) و دیا حەفتێ ژیدا پەیڤێن ( دلسۆز)، هەر ئێك ژ وانا پشتی ناڤەکی هاتینە ، بۆ هندێ دا ب رێیا وان وەسفا ناڤەکی بۆ بهێتە کرن بۆ وان ببنە تەمامکەر ، هەمی ژی وەکی گرێیەکا هەڤاڵناڤی دجهێ خۆدا بکار هاتینە. هەژی گۆتنێیە ، دهەمی ڕستەیاندا گرێیێن هەڤاڵناڤی ب هاریکاریا ئامرازێ دانە پاڵ ( ی ، ێ ، ا ، ێن ، ێت ، ێد ) ئەرکێ خۆ ئەنجامداینە ، کو دکەڤنە دناڤبەرا ناڤی و گرێیێدا .

**دەستوور :**

**گرێیا هەڤاڵناڤی کۆمەڵە پەیڤەکن ب سەرئێکڤە د ڕستەییێدا ئەرکێ هەڤاڵناڤی دبینیت ، و وەسفا ناڤەکی یان جهناڤەکی دکەت ، ب هاریکارییا ئامرازێ دانەپاڵ ، ئەڤ گرێیێن هەڤاڵناڤی ب گەلەک شێوەیان دهێنە دروستکرن .**

## ڕاهێنان ( ١ )

ڤان ڤالاییێن خوارێ ب گرێیەکا هەڤاڵناڤی پڕبکە :-

١- مرۆڤێ .............. ناگەهیتە هیڤیێن خۆ .

٢- خاڵە ڕەجەب مرۆڤەکێ ...................ێ باژێرێ سولەیمانیێ بوو.

٣- دگەل هەڤالێ ................ کارنەکە .

٤- خاتوون میتێران ب دایکا .................. کوردان دهێتە دانان .

٥- فێقییێ .............. نەخۆ.

## ڕاهێنان ( ٢ )

ڤان ڤالاییان ب گرێیەکا گونجای پڕبکە وجۆرێ وێ ژی بنڤیسە:-

١- ............... نەخۆشە.

٢- کوڕێ ............... پسمامێ منە .

٣- ................ دێ کڕم .

٤- کاغەز ............. دهێتە دروست کرن .

٥- دڤێت تە قوتابییێ ............... خوش بڤێت .

٦- ................ نڤیسی .

٧- مرۆڤ ............. دژیت .

## ڕاهێنان ( ٣ )

شەش ڕستەیان بینە ب مەرجەکی د دوو ڕستەیاندا گرێیا ناڤی هەبیت و درستەیەکا دیدا گرێیا هەڤاڵکاری هەبیت و سێ ڕستەیێن دیدا گرێیا هەڤاڵناڤی هەبیت .

## ڕاهێنان ( ٤ )

دێ چەوا گرێیا ناڤی و هەڤاڵناڤی و هەڤاڵکاری ژێك جودا کەی ؟ ب نموونەڤە روون بکە .

## ڕاهێنان ( ٥ )

ژڤان گرێیێن خوارێ، جۆرێ گرێیێ دیاربکە و درستەیاندا بکاربئینە :

( دڵ بخەم ، دوهی بشەڤ ، کانییا چیایی ، دوو دوو ، دار سێڤ ، نیڤا شەڤێ ) .

## ڕاهێنان ( ٦ )

ڤان ڕستەیێن خوارێ شرۆڤەبکە :

١- کرێکار پشتی نیڤرۆ ژ کارگەها جگاران ڤەگەڕیایە .

٢- کچا دلخۆش خۆ بۆ گۆڤەندێ ئامادەکر .

## ڕاهێنان (٧)

جوداهیێ دناڤبەرا ئەڤێن خوارێ دیاربکە :-

١ –أ. من تەختێ ڕەش ژێبر .            ب . تەختێ ڕەش دەستێن مە پیس دکەت .

٢ –أ . زارۆکێ زیرەکە .            ب . زارۆکێ زیرەك ، چاڤدێرێ پۆلێیە .

# گرێیا هەڤاڵکاری

## ڤێ پارچە نڤیسینێ بخوینە : -

ڕۆژا ئەینی ئەز و هەڤالێن خۆ چووینە شەهیان و گوڤەندا ئاریێ برادەرێ مە ، ئاری پار نە پێرار زانکۆ تەمامکرییە و بوویە ئەندازیارێ بیناسازی ل وەزارەتا ئاڤەدانکرنێ یا هەرێما کوردستانێ ، نهۆژی سەرگەرمێ کار و ئیشێ خۆ یە و ب دلسۆزی ل بوارێ پسپۆریا خۆدا کاردکەت .

گوڤەند ل ڕۆژەکا خۆش و ل سەیرانگەهەکا بنارێ چیایێ سەفین هاتبوو سازکرن . داوەتی دەست دەستە بەرەڤ وی جهی دچوون ل وێرێ هەمی ب دلخۆشی و ب گەرمی ژ لایێ ئاری ڤەدهاتنە پێشوازیکرن . جهێن تایبەت بۆ وان ل بن دار و دەرختێن سەیرانگەهێ هاتبوونە چێکرن ، پشتی ئاهەنگێ دەسپێکری هەمی خڕڤەبوون ، ئەڤجا شاهی و گوڤەند و داوەتێ دەست پێکر، کو بۆ ماوێ سێ دەمژمێران ڤەکێشا ، پشتی کو شەهیان و گۆڤەند ب دوماهی هاتی ، هەر ئێك ژ خواستیێن شەهیانێ ڤەگەڕیا بۆ جهێ خۆ .

## بەرچاڤکرن :

پارچە نڤیسینا سەری ب شێوەکێ کورت بەحسێ شاهیا ئاری دکەت ، کو تێدا مە هندەك دەستەواژە بکارئینانە وەکی ( گرێیان) ، بۆ هندێ دا وەسفا کاری پێ بکەین بۆ نموونە : -

١- دڕستەیا ( ئاری پار نەپێرار زانکۆ تەمامکرییە و بوویە ئەندازیارێ بیناسازی) دا دەستەواژەیا ( پار نە پێرار ) بۆ وەسفکرنا کارێ ڕستەیێ بکارهاتییە ، ئەو دەستەواژەیە سنوورەك بۆ روهنکرنا ڕامانا کارێ ڕستەیێ دانایە ، چونکی دەمێ تەمامکرنێ بۆ مە دیارکرییە ، لەوا دبێژنێ ( گرێیا هەڤاڵکاری ) .

٢- هەروەسا دڕستەیا ( داوەتی دەستە دەستە بەرەف وی جهی دچوون ) دا، دەستەواژەیا ( دەستە دەستە ) ، ب رێکا دووبارە بوونێ دروست بوویە، وەسفا کارێ ڕستەیێ دکەت و سنوورەکی بۆ روهنکرنا ڕامانا وێ دادنیت، هەر ژ بەر وێ ئەگەرێ مەزانی ، کا داوەتی ب چ ڕەنگ بەرەف وی جهی دچوو ، لەوا ئەوژی دبیتە ( گرێیا هەڤاڵکاری ) .

٣- دیسان دڕستەیا ( ل وێرێ هەمی ب دلخۆشی و ب گەرمی ژ لایێ ئاری ڤە هاتنە پێشوازیکرن ) دا ، هەردوو دەستەواژەیێن ( ب دلخۆشی ) و ( ب گەرمی ) وەسفا کارێ (هاتنە پێشوازیکرن ) دکەن کو کارەکێ لێکدایییە، سنوورەك بۆ روهنکرنا ڕامانا وێ دانایە ، چونکی ژ بەر وان ئەگەران ئەم دزانین کا چەوا پێشوازی ژ لایێ ئاری ڤە بۆ هاتییە کرن . لەورا ئەوژی دبنە ( گرێیێن هەڤاڵکاری ) .

٤- هەر دیسان دڕستەیا ( جهێن تایبەت بۆ وان ل بن دار و درەختێن سەیرانگەهێ هاتبوونە چێکرن ) دا ، دەستەواژەیا (ل بن دار و درەختێن) وەسفا کارێ ڕستەیێ دکەت و سنوورەکی بۆ ڕامانا وێ دادنیت و لەورا ئەوژی بیتە ( گرێیا هەڤاڵکاری ) .

**دەستوور :**

**گرێیا هەڤاڵکاری کۆمەڵەکا پەیڤێن ب سەر ئێکڤەنە ، ب تنێ ڕامانەکا تەمام نادەن ، و دڕستەیێ ژی دا وەسفا کارێ ڕستەیێ دکەن ، و سنوورەکی بۆ روهنکرنا ڕامانا وێ دادنن ، ژ ڤی لایڤە ب تەمامی ئەرکێ هەڤاڵکاری دبینن و دڕستەییێدا بۆ روهنکرنا ( دەم و جه و هژمار و چەوایییێ ) ب کار دهێن .**

## ڕاهێنان ( ١ )

دڤان ڕستەیاندا خیچەکێ ل ژێر گرێیا هەڤاڵکاریدا بکێشە :

١- سپێدی زوو ب هینکاتی سیاری ترومبێلێ دبن .

٢- د دۆلێدا دوو دوو بۆ ڕاڤ و نێچیرێ دچن .

٣- دمەها گولانێدا تاقیکرن دەست پێ دکەن .

٤- ئەم هەمی ب پێیان چووینە قوتابخانەیێ .

٥- ب دەمژمێرەك و نیڤا ژ سولەیمانیێ ب ترومبێلێ دێ گەهیە کەرکووکێ.

٦- زاڕۆك ل سەر کورسیێ ڕونشتییە .

## ڕاهێنان ( ٢ )

ڤان ڤالاییان ب گرێیەکا هەڤاڵکاری پڕبکە :

١- ............. سەفەرێ نەکە .

٢- نژیار ............... نڤستییە .

٣- فڕۆکە ............... ل ئەسمانی دفڕن .

٤- من ئەڤ هەسپە ........... کڕی .

٥- کاروان ................ یێ ئێکێ دەرچوو .

٦- ............... چەژن دێ هێت .

٧- ...............نەڕوینە .

## ڕاهێنان (٣)

چەوا گرێیا ناڤێ و هەڤالناڤێ و هەڤالکاری ژ ئێك و دوو جودا دبن.

## ڕاهێنان (٤)

ئەڤان گرێیێن ل خوارێ د ڕستەیەکێدا بکاربینە و جۆرێ وان دیاربکە.

(گەلەك خۆش ، دارێن چیای ، دارا سێڤێ ، گەلەك زوی).

## ڕاهێنان (٥)

ڤان ڕستەیان شرۆڤەبکە :

١- ئەهلۆی ل سەر بەری دادا .

٢- باران هێدی هێدی دباریت .

٣- هەفتیا بۆری مە ڕۆمانا خۆ چاپکر .

(وانەیانۆزدێ)

# کارێ تێنەپەڕ و کارێ تێپەڕ

أ – ١ . دلێر نڤست .

٢. کۆتر فڕی .

ب – ١ . پێشمەرگە وەڵاتی دپارێزیت .

٢ . نەوزاد چیرۆکێ دنڤێسیت .

## بەرچاڤکرن :

١– ئەگەر بنێرینە ڕستەیێن پشکا ( ئـ ) دێ بینین :

* کارێ ( نڤست – فڕی ) هەر ئێك ژ وان کەفتیە پاڵ کەسەکی یان تشتەکی ، ئانکو هەر ئێکی ژ وان کارەك هەیە .

* دڕستەیا ئێکێدا کارێ ( نڤست ) کارەکێ بۆرییە و ب تنێ شیایە ڕامانا ڤێ ڕستەیێ تەمام بکەت ، و مەبەستا وێ ژی دیار بکەت .

* ژ لایەکێ دیڤە دێ بینین ئەرکێ کارێ ( نڤست ) ژ ( بکەر ) ی کو ( دلێر ) ە دەرباز نابیتە سەر کەسەکی یان تشتەکێ دی .

* دڕستەیا دوویێ ژێدا ئەرکێ کارێ ( فڕی ) ژ بکەرێ ڕستەیێ دەربازنابیتە سەرکەسەکی یان تشتەکێ دی .

ئەڤجا هەر کارەکێ ب تنێ ڕامانا ڕستەیێ تەمام بکەت و ئەرکێ وی ژ ( بکەر ) ێ کارێ وێ دەربازنەبیتە سەرکەسەکی یان تشتەکێ دی ، دبێژنێ کارێ ( تێنەپەڕ ) .

٢- ئەگەر بنێڕینە ڕستەیێن پشکا ( ب ) دێ بینین :

دڕستەیا ئێکێدا پەیڤا ( دپارێزیت ) کارە و بکەرێ وێ ژی ( پێشمەرگە ) یە. ئەگەر مە گوتبا ( پێشمەرگە دپارێزیت ) مە نەدزانی کا چ دپارێزیت ؟ ڤێجا بۆ تەمامکرنا ڕامانا ڕستەیێ ، ڤی کاری پێدڤی ب تەمامکەرەکی هەیە ، بۆ هندێ دا ڕامانا ڕستەیێ تەمام و ئاشکرا بکەت ،کو ژ نهو پێڤە دێ بێژینە ڤی تەمامکەری ( بەرکار ) .

هەر وەسا دڕستەیا دوویێدا کارێ ( دنڤێسیت ) پێدڤی ب پەیڤەکا دی هەیە هەتا ڕامانا ڕستەیێ تەمام و ئاشکرا بکەت ، چونکی ئەگەر مە گوتبا ( نەوزاد دنڤێسیت ) مە نەدزانی کا چ دنڤێسیت ؟

ژ بەر هندێ پەیڤێن ( وەڵات - چیرۆك ) دبنە ( بەرکار ) .

* ژ لایەکێ دیڤە دێ بینین ئەرکێ کارێ ، کو ( بکەر ) پێ ڕادبیت ژ وی دەرباز نابیت و دکەڤێتە سەر ( بەرکار ) ی .

* ڤێجا هەر کارەکێ ب تنێ لگەل بکەرێ خۆ نەشێت ڕامانا ڕستەیەکێ تەمام و ئاشکرا بکەت و پێدڤی ب پەیڤەکا دی هەبیت ، بۆ ڤێ تەمامکرنێ دبێژنێ کارێ ( تێپەر ) .

**دەستوور :**

١- **کارێ تێنەپەر :** ئەو کارە کو ب تنێ دشێت ڕامانا ڕستەیەکێ تەمام بکەت ، و ئەرکێ وی ژ بکەرێ کاری دەرباز نابیتە سەر کەسەکی یان تشتەکێ دی .

٢- **کارێ تێنەپەڕ ب هیچ رەنگەکی ( بەرکار )** ی وەرناگریت بەلێ دشێت ( تەمامکەرێ بەیاریدە ) وەرگریت وەکو :

نیوار چوو بۆ هەڤلێرێ .

٣- **کارێ تێپەر :** ئەو کارە کو ب تنێ لگەل بکەرێ خۆ نەشێت ڕامانا ڕستەیێ تەمام و ئاشکرا بکەت ، بەلکو پێدڤی ب پەیڤەکا دی هەیە ، بۆ ڤێ تەمامکرنێ ، ئەڤ پەیڤە ژێ ئەرکێ کاری د کەڤیتە سەر و دێ بیتە (**بەرکار**) ، یان ژێ .

کارێ تێپەر : ئەو کارە کو ئەرکێ وی ژ ( **بکەر** ) ێ کارێ وی دەربازدبیتە سەر کەسەکی یان تشتەکێ دی و دبیتە تەمامکەرێ کاری و دبێژنێ ( **بەرکار** ) .

٤- **کارێ تێپەر :** ئەڤ کارە دشێت ( **بەرکار** ) ی و(**تەمامکەرێ بەیاریدە**) وەربگریت وەکو : جوتیار زەڤیێ ب هەڤجارڕ(١)دکێلیت . دڤێ ڕستەیێدا پەیڤا ( زەڤی) بەرکارە و ( هەڤجار ) تەمامکەرێ بەیاریدەیە بۆ کارێ(دکێلیت).

(١) هندك دەڤەرا ل جهێ ( هەڤجار ) ( هنجار ) بکار دئینن .


کار
ژ لایێ دروستکرنێڤه
ساده
نه ساده
دارێژتی
لێکدای


هێز
تێپه‌ر
تێنه‌په‌ر


ڕامان
ته‌مام
نه‌ته‌مام


ده‌م
بوری
نه بوری

## ڕاهێنان ( ١ )

ڤان ڤالاییان ب کارەکێ تێپەڕ پڕ بکە :

١– من سێڤ ................ .

٢– زەلامێ هە خانی .............. .

٣– تە چەند کەو ............ ؟

٤– ئاڤان یا جلکان .............. .

٥– دارا ی گوندۆر ................ ؟

## ڕاهێنان ( ٢ )

ڤان ڤالاییان ب کارەکێ تێنەپەڕ پڕ بکە :

١– مللەت ب خواندنێ ................ .

٢– گیا لە سەر ڕەهێن خۆ ............... .

٣– کۆترا شێردلی ..................... .

٤– ژ هەمی عەوران باران ................. .

## ڕاهێنان ( ٣ )

بەرسڤا دروست هەلبژێرە :

١– دێ کڕین. کارێ (تێپەر ، تێنەپەر)ە.

٢– هات. کارێ (تێپەر ، تێنەپەر)ە.

٣– دێ تەمامکەم . کارێ (تێپەر ، تێنەپەر)ە.

٤– دێ هەلاویسیت. کارێ (تێپەر ، تێنەپەر)ە.

٥– نڤست . کارێ (تێپەر ، تێنەپەر)ە.

## ڕاهێنان ( ٤ )

ڤان کاران ب دروستی دڤالاییاندا دابنە :

( ب دەستڤەبینیت ، بوویە ، ئاشکرایە ، نەشێت ، دێ بینین ، نینە ) .

بارێ ئابووری ل تاخێن باژێران وەك یێن گوندان ............ چونکی ژیان ب زەحمەت ............ تشتێن پێدڤین و داخوازی زۆر بووینە لەورا ............ رژێما چینایەتی ل باژێران ............ و کەس ژی ............ ب تنێ هەمی پێدڤیێن خۆ ............ .

## ڕاهێنان ( ٥ )

## شرۆڤەکرن

١– مە پەرتووك چاپکر :–

مە : جهناڤێ سەربەخۆیە بۆ کەسێ ئێکێ یێ کۆ ، بکەرە .

پەرتووك : ناڤە ، تاکە ، گشتییە ، نەناسیارە ، بێ لایەنە ، بەرکارە بۆ کارێ ( چاپکر ) .

چاپکر : کارێ بۆرییە ، نزیکە ، لێکدایە ، تێپەرە .

٢– ڤان ڕستەیان شرۆڤەبکە :

أ – شووشە شکەست .

ب – شڤانی پەز چەراند .

## ڕاڤەکرنا پەیڤان

تێپەر : دەرباز بووی .

تێنەپەڕ : دەربازنەبووی .

بنێڕینە : بەرێخو بدەینە ، تەماشە بکەین .

پاڵ : رەخ ، تەنشت .

دانەپاڵ : ئێخستە سەر .

بۆری : چوویی ، رابوردوو .

مەبەست : رامان ، واتا .

ئەڤجا : ڤێجا ، جا .

دشێت : دکارێت ، دتوانێت .

هەڤجاڕ : هنجاڕ ، هەوجاڕ .

ڤاڵاهی : بۆشایی .

لەوڕا : ژ بەرهندێ .

چین : تەخە .

( وانەیابیستێ )

# بەرکار

١- پشیک گۆشتی دخۆت .

٢- کاروان داران دبڕیت .

٣- فەرهادی نڤێسینا خۆ خواند .

٤- نازدار گوڵان ئاڤددەت .

## بەچاڤکرن :

ڕستە ژ دوو بنچینەیێن سەرەکی پێکدهێت کو ئێک ژ وان بکەرە و یادی کارە ، هەر چ پەیڤەکادی ژ وان زێدەتربیت ، دبێژنێ ( تەمامکەر ) ، تەمامکەری ژی یان پشکا بکەری تەمام دکەت ، یان پشکا کاری ، ئەگەر بنێرینە ڕستەیێن سەری دێ بینین پەیڤێن ( پشیك ، کاروان ، فەرهاد ، نازدار) هەر ئێك ل جهێ خۆ بکەرە ، هەر وەسا پەیڤێن ( دخۆت ، دبڕیت ،خواند ، ئاڤددەت ) هەمی کارن .

دڤان ڕستەیاندا هندەك پەیڤێن دی دمینن ڤە کو نە بکەرن و نەکارن ، بەڵکو ڕامانا کارێن خۆ تەمامکرینە و ئەرکێ کارێن وان ژی کەفتینە سەر و دبێژنێ ( بەرکار ) ئەو پەیڤ ژی لپەی ڕستەیێن سەری دڤان خالاندا دەرکەفتینە :

١- پەیڤا ( گۆشت ) ڕامانا ( دخۆت ) پێ هاتییە تەمامکرن و ئەرکێ کاری ژی کەفتییە سەر دبێژنێ ( بەرکار ) .

٢- پەیڤا ( داران ) ڕامانا ( دبڕیت ) پێ هاتییە تەمامکرن و ئەرکێ کاری ژی کەفتییە سەر دبێژنێ ( بەرکار ) .

٣- پەیڤا ( نڤێسین ) ڕامانا ( خواند ) پێ هاتییە تەمامکرن و ئەرکێ کاری ژی کەفتییە سەر ،و دبێژنێ ( بەرکار ) .

٤- پەیڤا ( گوڵان ) ڕامانا ( ئاڤددەت ) پێ هاتییە تەمامکرن و ئەرکێ کاری ژی کەفتییە سەر دبێژنێ ( بەرکار ) .

**دەستوور :**

**بەرکار : پەیڤەکە دڕستەییێدا پشکا کاری تەمام دکەت و ئەرکێ کاری ژی دکەڤیتە سەر و هەردەم د وێ ڕستەییێدا هەیە یا کارێ وێ تێپەڕبیت .**

## ڕاهێنان ( ١ )

بەرکاری ژ ڤان ڕستەیێن خوارێدا بینەدەر : -

١- من گولەك چاند .

٢- زەڤی ئاڤێ ڤەدخۆت .

٣- تە کۆتر بەردا .

٤- مە هسپ بۆ وی هنارت .

٥- وان خانی بۆ ئازادی نیژەنکر بوو .

٦- هەوە گورگ کۆشت ؟

## ڕاهێنان ( ٢ )

ڤان پەیڤێن خوارێ وەکی ( بەرکار ) دڕستەییدا بکاربینە : –

( زەڤی ، جلك ، پەز ، هەوە ، سێڤ ، پووش ، پەلاتینك ، شیر ) .

## ڕاهێنان ( ٣ )

## شرۆڤەکرن :

أ – مێشا هنگڤینی شیراڤا گولان دمێژیت .

مێشا هنگڤینی : ناڤە ، بکەرە .لێکدراوە

شیراڤ : ناڤە ، بەرکارە .

ا : ئامرازێ دانەپاڵە ( خستنە سەرە ) .

گولان : ناڤە تەمامکەرێ ناڤێ ( شیراڤ ) ە .

دمێژیت : کارێ نە بۆریێ تێپەڕە .

یت : جهناڤێ لکاوە ، بۆ بکەری ڤەدگرییێت بۆ ( مێشا هنگڤینی ) کو بکەرە.

ب – ڤان ڕستەیان شرۆڤە بکە :

١– پەریزاد بەنیشتی دجویت .

٢– مە شێر دناڤ دارستانێدا دیت .

٣– ئەم دێ هەوە هنێرین .

## ﴿پشكا ئەدەب﴾

١- موفتی پێنجوینی .
٢- مارف بەرزنجی .
٣- قەدری جان .
٤- بێكەس .
٥- ئەمین زەكی بەگ .
٦- ئەسیری .
٧- دڵدار .
٨- سالح یوسفی .
٩- پرۆفیسۆرێ كورد ( د . كامیران بەدرخان ) .
١٠- كاردۆخی .
١١- سادق بەهائەدین .
١٢- سوارەی ئالیخانی زادە .
١٣- ئەحمەد دڵزار

# موفتی پێنجوینی



ناڤێ وی مەلا عەبدوڵلایێ کورێ مەلا کەریمە، ل ساڵا ١٨٨١ ز ل گوندێ بێستانە ل دەڤەرا پێنجوین ژ دایك بوویە ، د ژیێ زارۆکیێدا چوویە بەر خواندنێ ل حوجرەیان ، ل دەستپێکێ لنك بابێ خۆ خواندیە، پاشی ژ بۆ خواندنێ ل گەلەك باژێرێن کوردستانێ گەریایە ، وەکی ( پێنجوین ، مەریوان، بانە ، سەقز، بۆکان ، مهاباد ، سەراو ، سەرچاوە ، بیارە ) .

ددەمەکیدا کۆ دوماهیك قوناغا خواندنێ بوو ،ل بیارە ، ژ ئەگەرێ زیرەکی و ئاخفتن و پەیڤێن وی یێن رەوان ، مەلایێ مەزنێ وی سەردەمی ل بیارە مامۆستا مەلا عەبدولقادر ناسناڤێ ( موفتی ) پێدایە ، چونکی هەر دوی دەمیدا موفتیێ باژێرێ سنە ناڤێ وی مەلا عەبدوڵلا موفتی بوو ، ئەڤەژی هەر ب وێ بیرهاتنێ ب ڤی ناسناڤی هاتیە ناڤکرن ، د ژیانا خۆدا حەز ل مەلایەتیێ نەکرییە . دەمێ دەست ژ خواندنێ بەردای دوکانداری و جگارە فرۆشتن کریە کارێ خۆیێ رۆژانە ، ل ساڵا ( ١٩٤٦ )ز دەمێ کۆمارا کوردستان ل مەهابادێ هاتیە دامەزراندن ، هەر چەندە یێ نەساخ و پەککەفتی بوو ، بەلێ خوشتڤیا ڤێ سەربەخۆیا کۆمارا کوردستان وەلێکر کو بگەهیتە ناڤ جەرگێ ڤێ کۆمارێ ، هەتا ب چاڤێن خۆ هیڤیێن چەند ساڵان ببینیت ، ل وێرێ چەند پارچە هۆزان بۆ کۆمارا کوردستان ڤەهاندینە و دگۆڤارا هەڵاڵە دا بەلاڤەکرینە، ل رۆژا ١٩٥٢/٦/١٥ ز چوویە بەر دلوڤانیا خودێ

ل گۆرستانا ( حاجی شێخ ) ل پێنجوین تەرمێ وی یێ پیرۆز دهێتە ڤەشارتن، موفتی ددەمەکیدا ئەو دیمەنێن جوانێن کوردستانێ دیتینە و دناڤ گول و گولستانانئدا گەڕیایە و بایێ هۆزانێ مێشکێ وی گرتییە و ( سروشت)ی ئیلهاما هۆزانێ دایێ ، هۆزانێن موفتی زادەی هزرەکا خۆماڵی و گشت ئێش و ئازارێن مللەتێ وی بخۆڤە گرتبوون . چاڤێن وی ل ئاسۆیێ رزگاریا کورد و کوردستانێ و پێشکەفتنا دبیاڤێ ژیان و کاودانێن جڤاکێ کوردستانێ بووینە، وەکو هەر نیشتمان پەروەرەکی باوەری ب راپەڕینا سەرکەفتنا گەلێ خۆ هەبوویە .

دهۆزانێن خۆدا هاندان و پاڵپشتیا کارکرنێ کرییە . پشتەڤانێ تەخا جوتیار و رێنجبەرێن کورد بوویە ، گەلەك هاڤێتیە زۆرداران ، و تەخا دەربەگ و ئاغا ریسوا کرینە ، دبیاڤێ باوەریێ ب سەربەستی و شیانێن ئافرەتێ و دۆزا وێ ل مەیدانا کارکرنێ و سیاسەتێ و پشت بەستن ب شیانێن ئافرەتێ ، هەمی گاڤا هاندانا ئافرەتێ کرییە ژ بۆ کارکرنێ و باوەری بخۆ بوونێ . سەربەستیا ئافرەتێ ب بەرێ بنیاتێ گوهۆڕینا جڤاکی دانایە . هۆزانێن وی ژ لایێ ڕوخسارێڤە د سادە و ڕەوان و بێ گرێنە ، مرۆڤێن خوێندەوار و نەخوێندەوار تێ دگەهن ، ل ساڵا ( ١٩٥٩ )ز هندەك هۆزانێن وی هاتینە چاپکرن ، ژێرناڤێ ( سۆزی نیشتمان ) ل ساڵا ( ١٩٩٠ ) ز هۆزانێن وی ژێر ناڤێ ( دیوانی موفتی پێنجوینی ) هاتینە چاپکرن و ئەڤە ژی نموونەکە ژ هۆزانێن وی :

# گەورەیەك

گەورەیەک بۆ کەس نەبێ سێبەری
خۆم بۆ بگێڕم لە دەوری سەری ؟
بە وشکی بۆچی ببمە مەیتەری
وەختێ دەرکەوێ هەستم لەبەری
هەر خۆی دایما هەوڵی ژیانی بێ
یا خوا ئەو گەورە بەشی نەمان بێ
گەورەیەک چاوی لە فەقیر نەبێ
دەربەست ژیانی جوان و پیر نەبێ
مێمل بە ماڵ و دوژمن بە جان بێ
یا خوا ئەو گەورە بەشی نەمان بێ
گەورەیەک ساتێ لەژێر دەستی ئەو
ئارامم نەبێ بێ خۆراک و خەو
پاسەوانی بم بە ڕۆژو بە شەو
جوێن و شەقیش بێ بەراتەکەی ئەو
ئەگەر شۆرەتی وەک سلێمان بێ
یا خوا ئەو گەورە بەشی نەمان بێ

( سێ دێر بۆ ژ بەرکرنێنە )

## ڕاڤەکرنا پەیڤان

مەیتەر : ئەو کەسێ دەوارێ مەزن ب خودان دکەت .

شۆرەت : بناڤ و دەنگ .

مێمل : دوژمنێ هەر تشتەکی .

جان : گیان .

ساتێ : کاتێ ، گاڤەکی .

بەراتەکەی ئەو : چاکیێن وی . خەلاتێ وی .

سلێمان : مەرەما وی سلێمان پێغەمبەرە .

دەربەست نەبێ : گوهێ خۆ پێنەدەت .

جوان : لاو . جحێل . گەنج .

ئارامم نەبێ : من سەبر نەبیت .

## مارف بەرزەنجی



ناڤێ وی ( مارف ) ە کورێ ( شێخ عەبدولکەریمە) ، ژ بنەمالا شێخ حەسەنێ ( قەرەچێوارین ) ە ، ل هەیڤا شواتێ ( ١٩٢١ ) ز ل گوندێ (قادر کەرەم) ژ دایك بوویە ، هێشتا بچووك بوو، چوویە قوتابخانێ ، پۆلا چوارێ سەرەتایی ل قادر کەرەم تەمامکرییە ، پاشی هاتییە کەرکووکێ خوێندنا سەرەتایی و ناڤنجی و ئامادەیی ل کەرکووکێ ب دوماهی ئینایە ، ل سالا خواندنێ (١٩٤٤ - ١٩٤٥ ) ل کولیجا ماف ( حقوقێ ) هاتە وەرگرتن ، و ل سالا ( ١٩٤٨ ) تەمامکرییە و بوویە پارێزەر .

تێکوشەرەکێ ئازا و فیداکار بوو ، د زۆربەی راپەڕین و خۆنیشاندانێن سالێن ( ١٩٤٨ - ١٩٥٢ - ١٩٥٦ ) پشکداری کرییە ،د ماوێ ژیانا خۆدا تووشی دەردەسەریێ و خۆڤەشارتنێ و دەربەدەریێ و گرتنێ بوویە .

پشتی شۆڕەشا چواردەی تەمووزا ( ١٩٥٨ ) ز هاتە هەلبژاردن و بوویە سکرتێرێ ئاشتی خوازێن باژێرێ کەرکووکێ ، ل سەر داخوازیا جەماوەری ب سەرۆکێ شارەوانییا باژێرێ کەرکووکێ هاتە دامەزراندن . پشتی هەیڤ و نیڤا ب ئەگەرێ فتنە و شەڕ و پێکدادانان ل کەرکووکێ ل سالا ( ١٩٥٩) ز کو ل رۆژا ئاهەنگا بیرهاتنا ئێکێ یا شۆڕەشا چواردەی تەمۆزێ روودای، هاتە گرتن و رەوانەی دادگەها عورفی کر و حوکمێ سێدارەدانێ ل سەردا،

پشتی (كۆ دەتا ) هەشتی شواتێ (١٩٦٣ ) ز حوكمێ سێدارەدانێ هاتە ب جهـ ئینان و ل رۆژا ( ١٩٦٣/٦/٢٣ ) ل سێدارێ دا ، و گیانێ وی بوو ستێرەكا گەش ل ئاسمانێ كوردستانێ .

بەرهەمێن ئەدەبی یێن شێخ مارفێ هۆزانڤان و نڤێسەر و رۆژنامە نڤیس ئەڤەنە:

**١- هۆزان :** وەكی هۆزانەڤانەكێ بەرنیاس ل سەردەمێ دەركەفتنا گۆڤارا ( هیوا - شەفەق - رۆناهی ) و پشتی هنگی رۆژناما ( ئازادی ) دەركەفتییە و هۆزانێن خۆ بەلاڤكرینە .

**٢- گۆتار :** دوو جۆرێن گۆتاران نڤیسینە :-

ئـ : گۆتارێن گشتی ل سەر دیمكراسیێ و ئاشتیێ .

ب : گۆتارێن رەخنەیی و ڤەكۆلینێن ئەدەبی ، رەخنەگرەكێ ژێهاتی بوو ، گەلەك گۆتارێن رەخنەیی و ڤەكۆلینا ئەدەبی نڤیسینە و د رۆژنامە و گۆڤارێن كوردیدا بەلاڤكرینە .

**٣-چیرۆك :** شێخ مارف چیرۆكنڤیسەكێ ب شیان بوو ، چەند كورتە چیرۆك نڤیسینە وەك ( ئاواز و كەباب - گای پیرۆز - شەتڵ - جەژنێكی شادی - نامەی سەرسنوور - سەر لە بەیانی نەورۆزێك ) .

شێخ مارف رووناكبیرەكێ چالاك و زیرەكێ سەردەمێ خۆ بوو ، زمانێ ( عەرەبی و توركی و ئینگلیزی ) دزانی . گەلەك بابەتێن ئەدەبی و كۆمەلایەتی ( جڤاكی ) و رامیاری وەرگێڕاینە سەر زمانێ كوردی .

دقادا رۆژنامەگەریێدا رۆژنامەنڤیسەکێ شارەزا بوو و ئەندامێ دەستەیا نڤیسەرێن گۆڤارا شەفەق بوو .

شێخ مارفی بەرهەمێن خۆ ب ناڤێ ( پشکۆ ) یان ( شوان ) بەلاڤ کرینە . ل سالا ( ١٩٩٣ ) ز بەرهەمێن وی هاتنە کۆمکرن و د پەرتووکەکێدا هاتنە چاپکرن ب ناڤێ ( سەرجەمی بەرهەمەکانی مارف بەرزەنجی شەهید ).

## ( ئەلف وبێ )

ژ ( ئەلیفێ) هەتا ( یێ ) ، هەمی تشت ژێ پێکدهێن ، مە نەڤێت هەر ب گۆتن بیت بەلکی مە کریار دڤێت ، ژ ڤی دەرگەهی دێ گیر و گرفتێن دژوراریا ژیانا خۆ ئاخڤین :

**ئا - ئاو :** کەمایەی ژیانە گەڵێ جار ئەبێ بەهۆی زیان ، وەك لافاو ، ئەڵێن دەریا دەست کردمان بۆ دروست ئەکەن ، یەك لە دەربەندیخان ، ئەوی تر لە دوکان . ولاتەکەمان ئەمەی کەم بوو بۆ سەیران و ڕابواردن بەلام بەراوە خواکردەکانی شارەزوورو بتۆین و ڕانیەمان ڕۆ . دیارە بوون بێ چوون نابێ . کە دەریامان بوێ ئەبێ بەراومان بچێ . جا بڕوانە ئاوی چاوی خاوەن بەراوەکان کە ڕوویان ئەکا بە بەراو ، داخەکەم ئاوەکە سوێرە ، ئەترسم شەکری کارخانە دەس پێ نەکراوەکەی شارەزووریش بەر ئاو بکەوێ .

**ئاگر :** کە ئاومان وت ئەبێ ئاگریش بڵێین ، یادی بەخێر ئاگری خەڵووزو گڕی دار بەڕوو بەهەرزان و بە ئاسان دەستمان ئەکەوێ ، بەلام ئێستا عەلادینمان لێ بووە بە چرای عەلادین ، ڕووی بەفر سپی بێ ئەگینا چەقەی ددان وەك تەقەی دەنووکی لەقلەقی بەهار وا ئەبوو . وابزانم بەفر هەر بەشی کوردستانی ئێرانمان ئەکا . وەك بووبێ بە کفنی کەس و کارە لە ناو چووەکانمان بەدەس بوومەلەرزەو سەرماوە .

**ئاسایش :** که ئاوو ئاگر هەبوو پێویستی ئاسایشین ، بێ ئەم ، ئاگر ئەبێ به ئاگری ژیان ، ئاویش بەروبوومی ڕەنج و کرداری هەمووان ئابا . له خۆرهەلاتەوه تا خۆر ئاوا ئەڵێن ئاسایش .

کوردیش ئەڵێ : ( شەڕ مەکەن و بێ داواش دامەنیشن ) .

**ب - بێ :** ئەگەر بۆم بێ ، یا بۆم بهاتایه وانه ئەبووم ، زۆر کەس وا ئەڵێ ، بابا گوڕ گوڕ یاخوا هەر گڕ بێ و گوڕەی بێ ، نەوتەکەی خوێنی گەشی ژیانمانه بینایی چاوەمانه ، بێ ئەو دنیامان تاریك و ماڵمان ویرانه .

برادەر : زۆرترین برادەری ئەمڕۆ هەر زمانییه ، تا لەڕووبن برادەرن ، پاشملەی یەکتری شتی ترن ، یا هەر برادەری پۆکەرن ، خۆزگه بێ درۆو دوو ڕوویی لەسەر بناغەیەکی ڕاستی و پاك برادەرایەتیمان پێك ئەهێنا ، ئەوسا ئەماندی برادەر له برا باشتره .

**ت -** خەریك بووم بنووسم ترس باش نییه ، بەلام چاك بوو زوو دەستم گرتەوەو بیرم کەوتەوه که دەردی ئێمه نەترسانه ترسان نییه .خوانه خواسته نالێم نەترسانەکەمان له سەرچاوەیەکی ئازایەتییەوه هاتووه ، بەڵکو نەترسانەکەمان منالانەیه ، گەلێ جار ئەگاته ڕادەیەك له وانەیەك ناوونیشان و شوێن و شێوەمان له ناو بچێت و بسڕێتەوەو گەلێمان له بەر پێ نەزانین پێ چاکه . بۆیه ئەمەوێت بڵێم : برا گەل بترسن و ترسان زۆر کەلکێ هەیه . ئەگەر ترس نەبێ قوتابی کۆشش ناکاو له تاقیکردنەوەدا سەرناکەوێ ، هەر وەها له ترسی برسێتی نەبێ کەس فرمان ناکا ، میللەتێکیش له نەمان و له ناوچوونی خۆی نەترسێ ، ناکەوێته هەولێ خۆپاراستن و بەهێزبوون پێشکەوتن ، له هەموو کەس زۆرتر کورد

ئەبێ بترسێ پێویستە لە هەموو خشەیەك ڕاچلەكێت ، چونكە ماران گازە .

**ح – حكوومەت :** وەكو ( ژان ژاك ڕۆسۆ ) ئەڵێ : ئەو دەسگایەیە كە دەڵێن لە سەرتادا خەڵك بە ئارەزووی خۆیان بۆ پارێزگاری كردنی ژیان و ماڵ و سەربەستییان دایان مەزراندووە ، كەچی لە پاشاندا ئەو بە ئارەزووی خۆی لە گەلێ شوێندا خەڵك لێ ئەخورێ لە ڕاستیدا ئەبێ هەموو ئامانج و تێكۆشانی حكوومەت بۆ كامەرانی و خۆش گوزەرانیی خەڵك بێ و بەیەك چاو سەیری هەمووان بكا . كە ئەو ئامانجەی لەبیر كردوو بوو بە بەردی سەر ڕێگای پێشكەوتنی خەڵك و دڕك و ئازار بۆ ژیانیان ، وەیا چینێك بۆ چینێ چەوسانەوە ، ئەوسا شایانی ئەوەیە ئەو دەسەلاتەی لێ بستێنرێتەوە و بدرێ بە دەستەیەكی ڕاست و دڵسۆزتر بۆ خەڵك .

**د – دەردو دەرمان و دەستی بێگانە :** خەوالووی وامان هەن هێشتا خەو بەوەوە ئەبینن كە لە ناكاوا بێگانە بێ دەردی گەورەمان تیمابكا ، كورد ئەڵێ : ( دەستی بێگا نە هەر بۆ مارگرتن باشە ). وە هەر كەسیك دەستی بۆ دەمی خۆی نەباو هەر كەسێكێش بە هیوای كاسەی ماڵ هاوسێ بێ ، بەبێ شێو سەر ئەنێتەوە . كەوابوو هەر ئەبێ بە هیوای دەستی خۆمان لە رزۆكە تا لە دەستە گۆج لە رزۆك و چەپەڵەكان ڕزگارمان كا ؟

**ر – ڕێكا :** هەموو شتێك ڕێگای هەیە ، كەون ،ئاسمان ،ژیان ،زانستی ، سیاسەت ، جەنگ ، ئاشتی ، ڕۆژنامەچێتی ، ڕزگاری، ئەمانە هەموو لەسەر

دەستووری تایبەتیی بەندەو بۆ دۆزینەوەو لێ گەیشتن و پێگەیشتنی ڕێگای تایبەتیی خۆی هەیە .

ئادەمیزاد بە پێی پێویستی و داماوی خۆی لەگەڵ شوێن و کات و پلەی پێشکەوتنیا ئەم ڕێگایانە یەك لە دوای یەك ئەدۆزێتەوە بۆ کامەرانی خۆی، بەلام ئەو ڕێگایەی ئادەمیزاد بڕیویەتی لە پێناوی ڕێگا دۆزینەوە دا زۆر دوورو سەختە ، بەناو لافاوی خوێن و عارەقا بە سەر بەردەبازی ملیۆنەها کەللەی مرۆڤی لە پێناو چوودا ، گەیشتۆتە ئەمڕۆمان . بۆ دۆزینەوەی ڕێگا ، ڕێگای هەر شتێك ، یا بلێین ئاشتی ، یا ئازادی ، یا نزیك کردنەوەی هاتوو چوو ، پێویستی چەند مەرجەکێن ، ئەبێ ژیانمان گەیشتبێتە ڕادەیەك، داماوی دۆزینەوەی ئەو ڕێگەیە بین ، وەك گوتوویانە داماوی و پێویستی دایە دۆزینەوەن ، تا زۆرترین خەڵك نەکەونە ئاخ و ئۆف و خۆزگە خواستی بۆ شتێك بیر ناکەوێتە بۆ دەس خستنی .

(شێخ مارف بەرزنجی)

( بتنێ بۆ خواندنێیە )

## ڕاڤەكرنا پەیڤان

| | |
|---|---|
| نامانەوێ | : مەنەڤێت ، ئەم ناخوازین . |
| ئەوێ | : دڤێت . |
| دەرگا | : قاپی – دەر – دەرگەهـ . |
| گیروگرفت | : تەنگو چەلەمە ، تەنگاڤی . |
| مایە | : هۆ ، سەرچاوە ، ئەگەر. |
| زەریا | : دەریا، بەحر . |
| کەم | : کێم . |
| بەراو | : بەرئاڤ . |
| خواکرد | : خودێ کری . |
| خاوەن | : خودان . |
| سویر | : شۆر . |
| خەڵووز | : ڕەژوو ، رەژی . |
| دەنووك | : نکل . |
| بوومەلەرزە | : بیڤەلەرز . |
| بەروبووم | : بەرهەم ، متا . |
| هەموان | : هەمیان . |
| پاش ملە | : نەکامی ( غەیبەت ) . |
| خوزگە | : خۆزی . |
| بناغە | : بنچینە ، بنواشە . |

**ناڵێم** : نابێژم .

**بسرێتەوە** : ژێببەت، نەهێلیت .

**مناڵ** : منداڵ ، بچوك ، بچیك ، زارۆك .

**تاقی کردنەوە** : ئیمتحان ، ئەزموون .

**ماران گاز** : مارگەستی .

**لە بیرمە** : ل بیرامنە .

**دەسگا** : دەزگەھ .

**ئارەزوو** : حەز .

**ناکاو** : ژ نیشکێڤە .

**شێو** : شێت .

**هاوسێ** : هەڤسوی .

# قەدری جان

## ١٩١١ز – ١٩٧٢ز



ناڤێ وی ( عەبدولقادر عەزیز جان ) ە ل ساڵا ( ١٩١١ ) ێ ل کوردستانا باکوور ل گوندێ ( دێریك ) ب ڕەخ باژێرێ ( ماردین ) ڤە ژ دایك بوویە. ل هەمان گوند دەست ب خواندنێ کریە هەتا گەهشتییە قوناغا ( دار المعلمین ) ل باژێرێ ( ئەزمیر ) ێ ب دوماهی ئینایە و بوویە مامۆستا دناڤبەرا ئەسکەندەرونە و ئەنتاکیێ دا . ل ساڵا ١٩٣١ ێ ژبەر ڕەوشا سیایی چوویە جزیرێ چەندەك ژ ژیانا خۆ ل وێرێ برە سەر پاشی چوویە دیمەشقێ و ئامودە و قامیشلۆ ، ل قامیشلۆ بوویە مامۆستا و پاشی هاتییە ڤەگوهاستن بۆ وەزارەتا پەروەردێ ل دیمەشقێ وەکو فەرمانبەر و ل دوماهیێ بوویە سەرپەرشت . هەر دڤێ قوناغێ دا دگەل نڤیسەر و ڕۆژنامە نڤیسێن ناڤدار د . کامیران بەدرخان و نورەدین زازاو جگەر خوێن و ئوسمان سەبری کەفتییەکاری و دەست ب بەلاڤەکرنا کوڤارا ( هاوار ) کرییە ، د ساڵا ١٩٣٦ ێ دا هۆزانڤان قەدری جان ئێکەمین هەلبەستا سەربەستی نڤیسییە و بەلاڤەکریە و بڤی چەندێ دبیتە سەرکێشێ کاروانێ هەلبەستا هەڤچەرخا کوردی ، ئێك بوویە ژوان هۆزانڤانێن هەردەم نویکرن دتۆڕێ کوردی دا کری ، ل ساڵا ١٩٥٥ ێ دەست ژ کارێ

وەزارەتا پەروەردێ بەردایە ، ژیانا وی پڕ نەخۆشی بوویە و چەندین جارا کەفتییە زیندانان . ل سالۆ ١٩٥٧ز دگەل شاندێ لاوێن کورد ژ سوریێ چوویە موسکۆ ژ بۆ پشکداری کرنێ د ڤیستەڤالا شەشێ یا لاوێن جیهانێدا، بارزانیێ نەمر ژی دیت .

جارەکا دی ڤەگەڕیا سەرکارێ میری و ل سالۆ ١٩٧١ز هاتە خانەنشین کردن ل ڕۆژا ١٩٧٢/٨/٩ێ دژیێ ( ٦١ ) سالێیدا چوویە بەر دلوڤانیا خودێ و ل گوڕستانا ( خالد نەقشبەندی ) ل دیمەشقێ دهێتە ڤەشارتن .

( قەدری جان ) ی دوو سروود ب بارزانیێ نەمر گوتینە لژێر ناڤێ ( سەردارێ کوردان بارزانی ) و ( شێرێ وەلات .... بارزانی هات ) .

( قەدری جان ) ی دزۆر کۆڤار و ڕۆژناماندا هەڵبەست بەلاڤەکرینە و پشکداری ددانا چەندین پەرتووکێن فێرگەهادا کرییە و زۆر هۆزانێن نە چاپ کری هەنە شارەزایی د زمانێ تورکی و عەرەبی و فرەنسیدا هەبوو زێدەباری زمانێ کوردی ب هەردوو زاراڤانڤە .

**بەرهەمێن قەدری جان :**

١ . داستانەك ب هۆزان ( ملحمە شعريە ) .

٢ . ئەلف و بێ یا کوردی .

٣ . دیوانا هەلبەستا – ١٩٥٧ز .

٤ . ڕۆمانا ( شڤانێ کورد) یا عەرەبێ شەمۆ ژ فرەنسی وەرگێڕایە سەر زمانێ کوردی ل سالۆ ١٩٤٧ز ب تیپێن لاتینی ل بەیروتێ چاپکرییە .

# بەگێ ئاخر زەمان

(قەدریجان)

١ . دۆستێ من
دوژمنێ پۆستی من
بەگێ ئاخر زەمان
ئەڤ زەمبلا تەپێ هات
نەمە داتێ ژ ئسمان
بەنێ وێ ڕزییا
ل ناڤا ڕێ قەتییا
ئو ... کەت
کەتە ناڤ دەریا سۆر
دەریا سۆر ژێڕا بوو گۆڕ
دەریا سۆر ژ فیرعەون و
چەند خودێ بچووکڕا بووکەفەن

★★ ★★ ★★

٢ . مووسا و موریدێن وی
هەمی
بێ پرو بێ گەمی
ژوێ دەریایێ دەرباز بوون
ژ جەورو جەفایێ خەلاس بوون
فیرعەون ل ور فەتسی
مووسا ل سەر ڕەقسی
نەمروودێ بچووک

مەب ئاگر دترسینە
پڤ مەشکا ڤالا
ئەی کەڤنارەیێ ساڵا
باوەڕیا دلێ مە
تاقەتا ملێ مە
ژ ئیمانا ئیبراهیم
پێترە . نەکێم ترە
ڤیا بزان
ئەی پێغمبەرێ دزان
دۆستێ من
دوژمنێ پۆستێ من
بەگێ ئاخر زەمان
ئەڤ زەمبیلا تە پێ هات
نەمە داتێ ژ ئسمان
★★ ★★ ★★
٣ . مەزنا تی
نەب پارە و مالە
نەب گۆڕینا کالە
مەزنا تی
ب جەوهەرێ ئینسانە
ب عیلم و عیرفانە

بەلێ ... ئەم خەزانی مالن
لێ زەنگینێ کەمالن
زەنگینێ ئیدیالین
دۆستێ من
دوژمنێ پۆستێ من
بەگێ ئاخر زەمان
ئەڤ زەمبیلا تە پێ هات
نەمە داتێ ژ ئسمان
★★ ★★ ★★
٤ . کۆشکا تەیە هیم ڤالا
یا ب نینۆکا پالا
ئین ب خوون
ئین برین
گەلەک ڕەبەن ژ بر چیتیا کوشت
تە ئاڤا کر دبندا ڕوونشت
ئەوێ ل سەر سەری تە هەلوەشە
گەر چی دلێ مە ب تە نائێشە
لێ ئەم دخازن
ب دل دبازن
زاڕۆیێن تەئێ بێ گونەه
کو ب هێژمار هەنە نەه دەه

ژوی تالووکێ خەلاس بکەن
ب رێیا ڕاست دا دەرباس بکەن
ڕێیا ڕاست ، رێیامە
ئەوە باوەڕیا مە
زنجیر شکاندن
ئارمانج گهاندن

★★ ★★ ★★

٥ . با بلیسکا بیستان
دیرۆکا ڕاستان
دبێژە
ببێژە
گوهـ مەدە ئەفسانەیێ دێوان
ب شۆندا نەمینە ژ کاروان
کاروانێ مەدەنیەت
گروهێ بەشەرییەت
خولاسە
پێشیێ و پاشییا فەلسەفە
فەلسەفە یامە
ئەڤە
دین ، مەزهەب ئیمان
ببە ئینسان ببە ئینسان

( کوپلەیا ئێکێ بۆ ژ بەر کرنێیە )

## ڕاڤەکرنا پەیڤان

| پەیڤ | رامان |
|---|---|
| پۆست | : پێست . پیست . |
| زەمبیل | : زمبیلە ، سەبەت ( سەلك ) . |
| ژێڕا | : بۆ ( وی ) . |
| گەمی | : بەلەم ، کەشتی . |
| لەور | : ل وێرێ . |
| ڤیا بزان | : ئەڤێ بزانە . |
| گۆڕین | : گوهۆڕین . |
| گۆڕێن | : قەبرێن وان . |
| کال | : پیر . |
| خەزان | : هەژار . |
| ئیدیال | : بیر ، هزر . |
| هێم | : بناغە . |
| ڤالا | : بەتاڵ . |
| پالا | : کرێکار . |
| ئین | : ئەوان . |
| برچێتی | : برسێتی . |

| | |
|---|---|
| ڕوونشت | : دانیشت . |
| دبازن | : ئارەزوویا مەیە . |
| زارۆ | : مندالْ . |
| تالووكێ | : مەترسی . |
| ئارمانج | : ئامانج . |
| بابلیسك بیستان | : سەدەی بیستەم . |
| دیرۆك | : مێژوو . |
| بە شۆندانەمینە | : ل دویڤ نەچە . |
| گروه | : بار ، كاودان ، بارەدۆخ . |
| دۆز | : كێشە . |

**ژێدەر :**


١– هەفتەنامەیا پەیمان ژمارە (١٥١).

٢–كتێبا زمان و ئەدەبێ كوردی بۆ پۆلا دووێ بنەڕەتی چاپا سێزدێ سالا ١٩٩٦.

# بێکەس

## ١٩٠٥ ز - ١٩٤٨ز



ژیانا وی پڕی دەردەسەری و کول و کۆڤان و مشەختبوون و دەر بەدەری بوویە ، ژ بەر هندێ ( فایق ) ێ کوڕێ ( عەبدوڵڵا بەگ ) ناسناڤێ ( بێکەس) بۆ خۆ هەلبژارد و خەلك ژی ب وی ناڤی دنیاسن ( فایق ) ل ساڵا ١٩٠٥ ز ل گوندێ ( سیتەك )کو دکەڤیتە باکورێ رۆژ هەلاتێ سولەیمانیێ ژ دایك بوویە ، ژ زارۆکینی ل حوجرەیا فەقیان خواندییە ، بۆ ماوێ چەند ساڵەکا ل بەغدا ژیایە ، پاش بابێ وی بەرەف تورکیا دچیت ، دایکا وی ژی پشتی هنگێ ل بەغدا دچیتە بەر دلوڤانیا خودێ ، لەورا فایق ل ساڵا ١٩١٨ ز دهێتە سولەیمانیێ لنك مامێ خۆ ، ل ویرێ دکەڤیتە بەر خواندنێ. جارەکادی ل ساڵا ١٩٢٤ ز دچیتەڤە بەغدا و پشتی ساڵەك دووساڵان دڤەگڕیتەڤە ، ماوەیەکی ل ( ئەشغال ) ێ کاردکەت ، پاشی دبیتە مامۆستا ل قوتابخانێن سەرەتایی

بێکەس شاعرەکێ کورد پەروەر و وەلات پارێز بوویە ، بو چەندین جارا ژ بەر بزاڤا وی یا ڕامیاری تووشی گرتن و ژکار دەرئێخستن بوویە مرۆڤەکێ چاڤ نەترس و ئازا بوو ، پشکداری د ڕاپەرینا (٦ ) ی ئەیلولا ١٩٣٠ز ل بەر دەگەهێ سەرایا سولەیمانیێ کرییە و تێدا برینداربوویە، چ جارا چاڤ ل پلە و پایە و پارا نەبوویە. هەردەم یێ نێزیکی بزاڤێن رامیاری یێن وی دەمی

بوو وەکی بزاڤا (ژ . ك) و پاشی ( پارتی دیموکراتی کوردستان). هۆزانێن خۆ ژ بۆ خزمەتکرنا گەل و نیشتمانێ خۆ تەرخان کرینە، پشکا زۆرا هۆزانێن وی بەحسێ کوردایەتیێ و نیشتمان پەروەریێ دکەن ژ بلی هندێ بابەتێن وی یێن جڤاکی بیاڤەکێ بەرفرەھ د دیوانا وی دا داگیر دکەت و کۆمەکا سروودێن زۆر خۆش بۆ زارۆکان دانایینە ، کو بۆ دەمەکێ درێژ قوتابیێن قوناغا سەرەتایی ب ئاوازێن خوش ، هەمی سپێدەهی یان ل قوتابخانێن خۆ دگوتن ژ وان :

**١- خوایە وەتەن ئاواکەی .          ٢- شاخی ڕەنگا و ڕەنگ گۆیژە .**

**٣- ئەی دلێران بێچووە شێران....... و گەلێکی تر .**

ل رۆژا ١٩٤٨/١٢/١٨ ل هەلەبجە دچیتە بەر دلوڤانیا خودێ و ل گوڕستانا گرێ ( سەیوان ) ێ ل سولەیمانیێ دهێتە ڤەشارتن .

ل رۆژا ١٩ ی خزیرانا ١٩٤٧ ز کار بەدەست و دەستهەلاتدارێن حکومەتا عێراقێ چوار ئەفسەرێن کورد پەروەر سێدارەدان . ئەوێن پشکداری د دامەزراندنا کۆمارا مەهابادێ دا کرین ، ئەو هەر چوار ئەفسەرێن شەهید و جوانەمەرگ ئەڤە بوون :

( عزەت عەبدولعەزیز ) ، ( مەحەمەد مەحمود قودسی ) ، ( مستەفا خۆشناو )، ( خەیرولّلا عەبدولکەریم ) بێکەس ئەڤ پارچە هۆزانا ب سۆز ل پێشوازیا وان شەهیدان گوتیە ، و کو تەرمێ دووان ژ وانا ژ بەغدا بو سولەیمانیێ برینە:

١ . قەومی كورد ئیسپاتی كرد بۆ عالەمی سەر ڕووی زەمین
میللەتێكی قارەمانن هەر ئەبێ سەربەست بژین
٢ . میللەتێ لاوی لە ڕێگەی سەربەخۆیی نیشتمان
بێتە بەر سێدارە ، بێ ترس ، دەم بەخەندە و پێكەنین
٣ . قەومی وانا نامرێ ، ئەژی ، با دوژمنی هەر شەق بەرێ
ساحیبی ڕۆڵەی نەبەردە ، خاوەنی عەزمی مەتین
٤ . ئەو كەسەی گیانی لە ڕێگەی نیشتمانا بەخت ئەكا
پێی مەڵێن مردوو ، شەهیدە ، وا لە فیردەوسی بەرین
٥ . لاوی كورد مەردە ، لە مردن قەتعییەن باكی نییە
پەندی پێشینانە ، ڕاستە ( بەرخی نێر بۆ سەبڕین )
٦ . وا وەتەن دیسان بە مەحزوونی ئەڵێ : ئەی لاوەكان
بۆچی وا مات و مەلوولن ، بەسیەتی شین و گرین !
٧ . ڕۆژی تێكوشانە ، سادەی هیممەتێ تاكو زووە
بەشكو لەم حالە نەجاتمان بێ و لە دیلی دەربچین !
٨ . گەرچی هەندێ كەس خەریكن ورگ و گیرفان پڕ ئەكەن
شەو بەبێ خەم سەر ئەنێنە سەر سەرین ، هەر سەرسەرین
٩ . پیاو ئەبێ دائیم خەمی قەوم و وڵاتی خۆی هەبێ
ئەو كەسانەی بێ خەمن حاشا نەوەی ئەم خاكەنین

★★ ★★ ★★

( سێ دێر بۆ ژ بەركرنێنە )

## ڕاڤەکرنا پەیڤان :

ساحیبی ڕۆلەی نەبەردە : خودانێ کوڕێن ئازایە .
بەخت ئەکا : خو فیدا دکەت ، دبەخشیت .
مات و مەلوون : بێدگ و خەفەتبارن .
سەر ئەنێتە سەرسەرین : سەر دئێخیتە سەر بالیفێ
هەر سەرسەرین : هەر دپووچ و بەد ڕەوشتن .

# ئەمین زەکی بەگ

## ١٨٨٠-١٩٤٨ ز



مێژوو نڤیس و رووناکبیر و ئەدیب و گەورە پیاوێ کورد ، ناڤێ وی ( محمەد ئەمین زەکی بەگ کوڕێ عەبدلرەحمانێ کوڕێ مەحموود ) ە ، ل سالا ( ١٨٨٠ ) ز ل باژێرێ سولەیمانیێ ژ دایك بوویە ، ل سالا (١٨٩٢ ) ز چوویە قوتابخانەیا سەرەتایی و پاشی پشتی سالەکێ چوویە پۆلا دووێ یا قوتابخانەیا ئامادەییا سەربازی ل بەغدا ، پاشی خوێندنا سەربازی ل ئەستەنبۆلێ پایتەختێ دەولەتا ئوسمانی تەمام دکەت و دبیتە ئەفسەر د لەشکەرێ شەشێ ل سالا (١٩٠٢) ز دا .

د سوپایێ ئوسمانیدا گەلەك پایە و پلەیێن جۆرا و جۆر پێ هاتینە دان . پشکداری کرییە د شەڕێ مەزنێ ئێکێ ل بەرەیێن جەنگێ ل عیراقێ و فەلستینێ و قەفقاسیا، ئەندام بوو د کۆمەلەیا دەستنیشانکرنا سنووری ل ناڤبەرا دەولەتا ئوسمانی ل گەل رووسیا و بولگاریا ، ل سالا ١٩٢٤ ز هات بۆ عیراقێ بوویە مامۆستایێ قوتابخانەیا سەربازی ، چەند جارەکا پۆستێ وەزارەتێن جۆرا و جۆر پێ هاتینە دان هەر وەسا یێ بوویە نوینەرێ سولەیمانیێ د پەرلەمانێ عیراقێدا . ل سالا ( ١٩٤٢ ) ز دەستێ خۆ ژ وەزارەتێ کێشایە و ب ئەندامەتییا ئەنجومەنێ پیران مایە حەتا ژیێ ( ٦٨ ) سالیێ ل ( ١٠ ) ێ تەمووزێ سالا ١٩٤٨ ز دچیتە بەر دلۆڤانییا خودێ و ل ( گردی سەیوان ) ل سولەیمانیێ هاتە ڤەشارتن .

ئەمین زەکی بەگ هەر ژ بچووکاتیێ حەزا مێژوویێ و شینوارێن کەڤن

هەبوو ، بەهرەیەکا زۆر ژ زانستێن عەرەبی و تورکی و فارسی وەرگرتبوو ، شارەزایەکا باش د زمانێن ئینگلیزی فەرنسی دا هەبوو ، ب دەهان پەرتووك ب زمانێ تورکی ل سەر کاروبارێن سەربازی دانایینە ، ب زمانێ کوردی ژی کۆمەلەك پەرتووکێن مێژوویی دانایینە وەك :

١- خولاصەیەکی تاریخی کوردو و کوردستان .

٢- ناودارانی کورد ( مشاهیر الکورد ) ب زمانێ کوردی د دوو بەرگا دا دانایە .

٣- ( تاریخی لیوای سولەیمانی ) ب کوردی ل سالا ١٩٣٧ ل بەغدا چاپکرییە.

(( ئەڤەژی نموونەیەکە ژ نڤێسینێن وی ))

## (زمانێ کوردی)

نەك زۆری خەلك بەلکو بەشی زۆری عولەماو موتەفەکریش لە خوسوسی کونهو ماهیەتی زمانی کوردییەوە یان بە تەواوی بێ خەبەرن وەیان زۆر خراپ تێ گەیشتوون . کە لە بابەت ئەم زمانەوە پرسیاریان لێ ئەکەی ئەلێن : ئەم زمانە کوردییە لەهجەیەکی تێکەڵ و پێکەڵی فارسییە و ئەسل و ئەساسێکی سەربەخۆو ڕێك و پێکی نییە ! . زاهر وایە سەبەبی جێگیربوونی مشابەهەت لە بەینی بەعزی کەلمات و ئەلفازی کوردی و فارسیدا ، وە دووەمیش ئیستعمال کردنی بەعزێ کەلماتی فارسی لە کوردیدا ، ئەگەر باش سەرنجی لێ بدەین ئەبینین کە لەیەك چوونی هێندێ کەلمەی کوردی لە فارسی نەتیجەی خزمایەتی یەکی بە قووەتی ئەم دوو زمانەیەو ئەم نەوعە مشابهەتە ل بەینی زمانە خزمەکانی تریشدا هەیە ،

ئینگلیزی و جەرمەنی و لاتینی چونکە هەموویان لە ئەسلێك – زمانی ئاری قەدیم ) هاتوونەتە خوارەوە ، ئەبینین کە زۆر لەفز کەلیمەیان لەیەك ئەچن و ئەم لێکچوونە هیچ ساحب مێشکێکی شارەزای تووشی غەلەتێکی وا نەکردووە کە بڵێ ئەسڵی ئینگلیزی جەرمانییە وەیا لاتینییە بەڵکو ئەڵێ : سەبەبی ئەم مشابهەتە دەلالەت لەوە ئەکا کە هەموو ئەم زمانانە لە ئەسلێك – کە زمانی ئاری یە – هاتوونە خوارەوەو کەلیماتی متشابهە یان کەلیماتی ئەسلیەن وە لە هەموویان ماوتەوەو کەمێك زۆرێك تەلەفوزەکەیان کۆڕاوە.

نازانم بۆچی ( متفکرین ) لە باسی زمانی کوردی و فارسیدا لەم حەقیقەتە لائەدەن و کوردییەکەمان ئەکەن بێچوویەکی لە ڕو لاوازی زمانی فارسی ؟ ! .

ئەگەر بە ئینساف لێکی بدەینەوە ئەبینین کە بەشی زۆر زۆر کەلیماتی کوردی لە شکل و تەلفوزدا لە فارسی ناکاو سەربەخۆیە ، ( برژانگ ، سك ، دایك ، باوك ، کچ ) واقعا لە بەینی (تووك ، لووت ، چەناگە ، کوڕی ) ی کوردی و ( موو – بینی ) (زنخ – زنخدان ) ، ( مژە ) ، ( شکم ) ، ( مادر )، ( پدر ) ، ( دختر ) ، ( پسر ) ی فارسیدا هیچ مشابهەتێکی لەفزی نابینرێ، جا کەوا بوو ئەم کەلیماتانە ئەبێ لە دوای جوێ بوونەوەی قەومی کورد و فارس ڕەنگە ئەم حادسەیە لە عەسری نۆهەم وەیا دەهەمی پێش میلاد دا واقع بوو– ئیجاد کرابێ ئەو پێنج مشابهەتەی ( تەلفوزی ، ئەساسی ، شکلی ، تەسریفی و نەحوی ) کە لە بەینی کوردی و فارسیدا ئەبینرێ دەلیلی ئەوەیە کە ئەم دوو زمانە لە ئەسلێکی مەعلوم ،

كه له پیێش هجرەتیانا بۆ تەرەفی غەرب زمانێكی موشتەرەك بووه ، هاتووته خوارەوەو هەر وەك زمانی ئەقوامی ئاری تر بەرە بەرە فەرقێكی كەم و زۆری تێ كەوتووه .

## ڕاڤەكرنا پەیڤان

عولەما : زانایان .

متفكرین : خاوەن بیران ، خودانێت هزرو بیرا .

له خسوسوسی : دەر بارەی .

ماهیەت : كاكل ، جەوهر ، بنەڕەت .

كەلیمه : وشه ، پەیڤ .

ئەسلێك : ڕەگەز ، بنچینه .

غەلەت : هەڵە ، چەوتی .

حەقیقەت : ڕاستی .

تووك : موو ، می .

لووت : دفن ، كەپوو.

چەناگە : چەم ، ئەرزینگ .

برژانگ : مژیلانگ .

حادیسه : رویدان .

عەسر : سەردەم ، چەرخ ، چاخ .

**ئەڤ نڤیسینە ب ڤی رەنگی دێ هێتە ژبەرکرن :**

١- یان ژ ( نەك زۆری خەڵك ) حەتا ( چونکە هەموویان لە ئەسلێك زمانی ئاری قەدیم هاتوونەتە خوارەوە )

٢- یان ژ ( نازانم بۆچی ( متفکرین ) لە باسی زمانی کوردی و فارسیدا) حەتا ( وەك زمانی ئەقوامی ئاری تر بەرە بەرە فەرقێکی کەم و زۆری تێ کەوتووە ) .

# ئەسیری
## ١٨٩٠-١٩٦٢ز



ناڤێ وی ( عەبدولخالق ) ە کورێ شێخ حوسینێ نەقشەبەندییە ، نازناڤێ وی یێ هۆزانێ ( ئەپیری – ئەسیری ) یە ، ل سالا ( ١٨٩٠ ) ێ ز ل باژێرێ کەرکووکێ ل تاخێ ( ئەخی حوسێن ) ژ دایك بوویە ، و چاڤێن وی ب دیمەنێن جوانێن کوردستانێ هاتینە ڤەکرن ، و دناڤ گولزارێن خواندن و زانیاریێ و ئەدەبیدا پشکوژا ژیانا وی گەش بوویە ، هەر ل دەسپێکا زاروکینیا خۆ دچیتە حوجرە و مزگەفتان بۆ خواندنێ . ل گەلەك جهێن کوردستانێ گەڕیایە ب دویڤ زانست و فێربوونێدا . وەکو ( سولەیمانی . بانە . سەقز . سنە . کرمانشان . هەمەدان ) و ل دویماهیێ ڤەگەڕیا باژێرێ کەرکووکێ ، و دڤی ماوێ خواندنێدا فێری گەلك جۆرێن زانستی بوو . وەکو ( ڕێزمانا عەرەبیێ . ڕەوانبێژی ، مەنتق ، ئوسولا کەلامی ) ئیجازا زانستی ژ مەلا عەلی حیکمەت سیامەنسوری وەرگرتییە .

ئەسیری ب مەرەما دیتنا برایێ خۆ نەجمەدینێ ئەفەندی ، خۆ گەهاندە ئەستەنبوولێ . ل وێرێ چاڤێ وی ب شێخ عەبدلقادرێ شێخ عوبەیدللاهێ نەهری کەفت و لڤین و چالاکیێن بزاڤا رزگاری خوازیا گەلێ کورد دیتن ، کو ژ لایێ کۆمەکا ڕەوشەنبیرێن خوین گەرمێن کورد ل وی باژێری دهاتنە ئەنجامدان . ئەڤێ چەندێ کارتێکرنەکا مەزن ل سەر ئەسیری هەبوویە . و عەشقا نیشتمان پەروەریێ د دلیدا پەیدابوو .

ب بيستنا دەنگ و باسێ وەغەركرنا بابێ خۆ و دگەل ب دوماهی هاتنا شەرێ ئێكێ یێ جیهانێ ل سالا ( ١٩١٨ ) ێ ز ڤەگەڕیا كەركووكێ ڤە بۆ سەرپەرشتی و ب رێڤەبرنا كاروبارێن تەكیایێ و مالێ و خێزانا خۆ .

– ماوەیەكی ل دادگەها شەرعیا كەركووكێ ب پلەیا نڤێسەرێ ئێكێ هاتییە دامەزراندن .

– ل ١٩٥٨/١١/١ هاتە خانەنشین كرن .

– ل ڕۆژا ١٩٦٢/٦/١٨ وەغەركرییە ، و ل گۆڕستانا شێخ ( محیەددین) ی ل كەركووكی هاتییە ڤەشارتن . ئەسیری هۆزانڤانەكێ زانست پەروەر بوو، خەلك پالێ دان بۆ هندێ كو بچنە قوتابخانەیان و فێری زانستی ببن .

د هەلبەستێن خۆدا داخوازا هاریكاری و ئێك گرتنا ریزا نەتەوا كورد كرییە، چونكو دزانی كو مللەت بێی هاریكاری و ئێك گرتن د كاروانێ خەبات و تێكوشانێدا ناگەهیتە ئارمانجێن خۆیێن ڕەوا .

ئەسیری وەك سیارەكێ زیرەكێ مەیدانا ئەدەبێ كوردی د ناڤ بەرا سالێن ( ١٩٢١ – ١٩٣٤ ) ز ب زیرەكی هەسپێ هۆزانا شۆڕەشگێری راكرییە چوار گاڤێ و هوزانێن وی وەك مەشخەلەكێ دۆل و نهالێن تاریێن كوردستانێ ڕوونكرینە . و ژ بەر ڤێ چەندێ ب هۆزانڤانێ شۆڕەشگێریێ قۆناغا پشتی حاجی قادرێ كۆیی دهێتە دانان .

ئەسیری داغبارێ دیمەنێن جوانێن كوردستانێ بوویە ، وێنە و نەقش و نیگارێ كوردستانا ڕەنگین ب شارەزایی د ناڤ تابلۆیێن هۆزانا خۆدا دكێشیت وەكو دڤێ پارچێدا دیار

# ( بێرە کوردستان )

بێرە کـــوردستان عەزیزم گەر تۆ ســـــەیرانت دەوێ
بت بەمە قەندیل ئەگەر گوڵزاری کوێستانت دەوێ
سەیری ئەو خیـــڵانەکــــە نیشـــتونـــە داوێنی چیـــا
با بچین بۆ مـــالێ کوردی گـــەر تۆ خۆێشـــانت دەوێ
بت مە پای تاقی لای ســـەر پیل و ســـەر میل و کرند
پێت نیشان دەم سەد هەزار ئاســـاری ســاســـانـت دەوێ
ئاوی ســـاف و ڕۆشـــنی داوێنی چەشـــمەکـــانی چیـــا
لێی بنۆشـــە دەم بە دەم گـــەر ئـاوی حـەیوانت دەوێ
لاوی کـــوردی من ، لە بەرکـــــە شاڵی زاخو و ئـــامێدی
گەر تۆ سەد چاتر لە ڕەنگی شـــاڵی کرمـانت دەوێ
هەڵسە گەشتی چیمەن و گوڵزاری کوردستان بکە
گـــەر لـــە بـــۆ دەردی دەروونت داو و دەرمـــانت دەوێ
ڕوح و ماڵت ســـەرفی ڕێگەی میللەتت کە ڕوحەکەم
گـــەر لـــە خـــوا لوتفی عەمیم وجودو ئیحسانت دەوێ
ئەی ئەســـیری هێندە عەشقی میللەتی کوردت هەیە
بشـــمری لام وایە قـــەبری گـــردی ســـەیوانت دەوێ

( سێ دێر بۆ ژ بەرکرنێنە )

## ڕاڤەکرنا پەیڤان

| | |
|---|---|
| بێرە | : وەرە . |
| سەیری ئەو خێلانەکە | : سەحکە ئەو عەشیرەتێن هە . |
| نیشتونە داوێنی چیا | : ل دویماهیا چیای خیڤەتێن خۆ دانایـنە . |
| خۆێشانت دەوێ | : تە خزم دڤێت . |
| | خۆێش = خزم ئانکۆ کەس و کار . |
| پای تاقی | : ناڤێ جهەکی یـە . |
| سەرپیل و سەرمیل و کرند | : ناڤێ سێ جهانە . |
| چەشمەکان | : کانی (چاڤ ) . |
| لێی بنۆشە | : ژێ ڤەخۆ . |
| ئاوی حەیوان | : ئاڤا ژیـانێ . |
| لە بەرکە | : بکەبەرخۆ . |
| چاتر | : چێتر ، چاکتر ، باشتر . |
| گەشت | : گەریـان ، سەیران . |

## دلدار

## ١٩١٨ - ١٩٤٨ ز



یونسێ مەلا ڕەئووف ل ( ٢٠ ) ێ شواتا سالا (١٩١٨ ) ێ ز ل ( کۆیە ) ژ دایك بوویە ، بۆ جارا ئێکێ ل ڕانیە دچیتە قوتابخانێ و بەردەوامیێ ددەتە خواندنێ ، هەتا ل سالا ( ١٩٤٥ ) ێ کۆلیژا ماف ( حقوق ) ل بەغدا تەمام دکەت ، و دبیتە پارێزەر .

دلدار هۆزانڤانەکێ نیشتمانپەروەر بوو ، شەیدایێ سروشتێ جوانێ وەلاتێ خۆ بوو ، هەلبەستێن حاجی قادرێ کۆیی و نالی و عەونی و وەفایی و کوردی و بێکەسی و پیرەمێردی ژێدەرێن ئیلهاما هۆزانێن دلدارینە ، هەروەسان سروشتێ جوان و ڕەنگینێ کوردستانێ هۆکارەکێ سەرەکی بوو د بەهرا شیعرییا دلداریدا ، زێدەباری ئەڤێ چەندێ ژی بارێ نەخۆشێ ژیانا وی ب خۆ هێڤینێ هۆزانێن دلداری بوون ، ئەگەر ژیانا وی ب دوماهی نەهاتبا ئەم دپشت ڕاستبووین ژ دلداری دا گەهتە گوپیتکا هەرە بلندا ئەدەبیاتێن کوردی.

ئێکەمین پارچە هەلبەست ل سالا ( ١٩٣٥ ) ێ ل ژمارە ( ٢ ) یا گۆڤارا ( ڕۆناکی ) بەلاڤەکرییە .

دلدار دهەلبەستێن خۆدا شیان و بەهرەیەکا مەزن نیشا ددەت . و خودان فەلسەفەکا بلند بوویە ، داغبارێ بیرو باوەرێن کوردایەتی بوویە ،

هەلبەستێن وی دسادە و ڕەوانن ، و دپڕی سۆزن ، پشکا پتر ژێ ل دوور بابەتێن نیشتمانپەروەری و کۆمەلایەتی دزڤڕن ، دیوانەکا چاپکری ب ناڤێ (دیوانی دلدار) دگەل دەهان گۆتارێن ب نرخێن ئەدەبی و ڕامیای و ئابووری ل پشت خۆ هێلاینە . ل ١٩٤٨/١١/١٢ ل بازێرێ هەڤلێرێ وەغەرکرییە ، و هەمی هیڤیێن خۆ ب وی ژیێ کورت لبن ئاخ کرن .

نموونەیەك ژ هەلبەستێن وی : –

١ . کوردستانی خۆش ، نیشتمانی جوان
تو قیبلەگاهی منی بێگومان
٢ . چاوم پشکوتووی شاخاکانتە
فێری ژیانی باخەکانتە
٣ . دەنگیشمشالی شوانەکانت
زریق و باقی جوانەکانت
٤ . قاسپەی کەوانی قەد کێوەکانت
خوڕەی ئاوەکەی نشێوەکانت
٥ . ئەمانە هەموو گوێیان گردمەوە
هەوێنی شیعری دلیان گرتمەوە
٦ . نەونەمامێ بووم لەم خاکە ڕووام
بە خۆشەویستی وەلات ئاودارم
٧ . بەلێ کوردستان تۆ منت خولقان
تۆ منت خولقان پێت بەخشیم ژیان
٨ . خۆشی ژیانم خۆشی ژینتە
ئێشی ژینی من ڕۆژی شینتە

**٩ . چونكه كوردستان ، نیشتمانی جوان**
**تۆ قیبلەگاهی ، دڵی بێگومان [١] .**

**( سێ دێر بۆ ژبەركرنێنە )**

## ڕاڤەكرنا پەیڤان

| | |
|---|---|
| شەیدا | : عاشق ، ئەڤیندار . |
| هەوێن | : هێڤێن . |
| پشكو توون | : ڤەكری . |
| زریق و باقی | : دەنگێ یاری كرنێ . |
| گوێیان كردمەوە | : گوهێن من ڤەكرن . |
| نەونەمام | : شتلا تازە . |
| پێت بەخشیم | : تە دایە من . |

(١) ئەڤ هەلبەستە دەربڕینێ ژ فەلسەفە و بیر و باوەرێن هۆزانڤانی بخۆ دكەت .

# سالح یوسفی

## ١٩١٨ - ١٩٨١ ز



ناڤێ وی ( سالح ) ە کورێ ( عەبدللایێ یوسفی ) یە ، ئێك بوو ژ رووناکبیر و خەباتکەرێن مللەتێ مە ، ل سالا ( ١٩١٨ ) ێ ز ل گوندێ ( بامەرنێ ) سەر ب قەزا ( ئامێدیێ ) ل پارێزگەها دهۆکێ ژ دایك بوویە.خواندنا خۆ یا سەرەتایی ل گوندێ بامەرنێ و دواناڤنجی ل بەغدا تەمامکرییە ، ل سالا ( ١٩٤٣ ) ێ ز ژ کولیژا ( شەریعە ) ل بەغدا دەرچوویە .سالح یوسفی رۆلەکێ مەزن د بزاڤا رزگاری خوازیا گەلێ کورددا گێرایە ، ئەندامەکێ چالاکێ پارتا( هیوا ) و پاشی (پارتی دیموکراتی کوردستان) و پاشی ( حیزبی سۆشیالیستی کوردستان ) بوو ، هەر دیسان رۆژنامەڤانەکێ ژێهاتی بوو ، د بارێ رەوشەنبیریدا خزمەتەکا زۆر هەیە ، سەرنڤیسەرێ گۆڤارا ( ئەستێرە ) و ( رۆژی کوردستان ) بوو . پتریا هۆزانێن وی باسی کوردایەتیێ دکەن ، و دهێنە هژمارتن ب هۆزانا رامیاری .

هەر وەسان داخوازی دکر کو بیرا ئازاد سەر هەلدەت و بەرەڤ پێش بچیت.

ل سالا ( ١٩٨١ ) ێ ز ب پیلانەکا رەش ل بەغدا دهێتە شەهید کرن .

ئەڤە ژی نموونەیەکە ژ هۆزانێن وی : -

ڕۆژا مێرو خورتا هەلات
هاتن ژ هەوارێ تە ، وەلات

ژیێ لاوەتی یە خەلات
جانێ خۆ دکەینە قەلات

ئەڤرۆ ڕۆژا مە مێرانە
هەولی خورت و عەگیدانە

گۆری کرن خۆش سەیرانە
د ڕێکا وەلاتیدا قوربانە

ئەم پلنگێ زەند ئاسنین
شێرێت وەلاتی مەزنین

سنگ چیاینە عەرد د ڕەنین
نەهنگێت شەڕێ بێ بنین

نەیارا هەمیا دێ سوژین
دا بسەربەستی و هونەر بژین

( سێ دێر بۆ ژ بەرکرنێنە )

## ڕاڤەکرنا پەیڤان

ژیێ لاوەتی : ژیێ گەنجینیێ .
جانێ خۆ : گیانێ خۆ ، ڕحا خۆ .
عەگید : زیرەك و خورت .
قوربان : گوری کرن .

# پرۆفیسۆرێ کورد
# (د . کامیران ئەمین عالی بەدرخان )
# ١٨٩٥-١٩٧٨ ز



د . کامیران ئەمین عالی بەدرخان ل سالا ( ١٨٩٥ ) ز ل ئەستەنبۆلێ ژ دایك بوویە . ژ بنەمالا بەدرخانیانە ، خواندنا خۆ ل ئەستەنبۆلێ ب دوماهی هێنایە ، پشتی سەرکەفتنا شۆرەشا ( کەمالستان ) و حاشاکرنا وان ژ هەمی مافێن کوردان ، سەرۆکێن کوردان ژ وەلاتی هاتنە دوور ئێخستن ، ئەمین عالی بەدرخان و کورێ وی ( ئەحمەد سورەیا) چوون ل وەلاتێ (میسر) ێ ئاکنجی بوون ، کامیران و جەلادەت ژی چوونە ئەلمانیا و دەست ب خواندنا بلند کر ل کولیجا حقوقێ و باوەرنامەیا ( دکتۆرا ) وەرگرت ، پاشی ل زانکۆیا ( سۆربۆن ) یا فەرەنسی باوەرنامەیا بلندا فەلسەفە و ئادابێ وەرگرت . ل ئەوروپا تێکەلی دگەل گەلەك ژ ئەدیب و نڤیسەرێن ناڤدار کر وەکی ( لوسی پۆل مارگرێت ، مارگرێت رۆدینکۆ ) . گۆتار ب زمانێ کوردی و زمانێن دی د کۆڤارێن ( هاوار و رۆناهی ) دا بەلاڤەکرینە ، هەر وەسا هەلبەستێن نیشتمانی ژی ل ژێر ناڤێ ( گەرۆك ) بەلاڤ کرینە .

ل دەسپێکا سالا ( ١٩٤٣ ) ز دا ل ( بەیرۆت ) ێ حەفتەنامەیا (رۆژا نوو) وەشاندییە ، ل سالا ( ١٩٤٣ ) ز دا گۆڤارا ( ستێر ) دەرئێخستییە. ل سالا ١٩٤٧ ز چوویە فەرنسا و ل وێرێ ( سازگەها لێکۆلینێ یا کوردی) دانا و کوڤارەك ب ناڤێ ( بولتە نامەرکەزا لێکۆلینێ یا کوردی) دەر ئێخست .

دوازده سالان بێ پاره زمانێ کوردی ل پەیمانگەها زمانێن زیندوو وانه گوتینه و خزمەتەکا زۆر یا زمانێ کوردی کرییه . د . کامیرانی گەلەك خزمەتا زمان و ئەدەب و دۆزا مللەتێ کورد کرییه . ل سالا ١٩٧١ ز بوویه ئەندامێ کارا یێ کۆڕێ زانیاریێ کوردی ل بەغدا .ل سالا ١٩٧٨ ز ل پاریس پایتەختێ فەرەنسا دچیته بەر دلوڤانییا خودێ و ل سەر وەسیەتا وی مالێ وی هاته تەرخانکرن بۆ دامەزراندنادەزگایەکێ رۆشنبیری و زانستی ب ناڤێ ( بەدرخان – کوردستان ) ،پشتی مرنا وی پەرتووکخانا وی پێشکیشی ( ئەنستیتۆیا کوردی ) ل پاریس هاتەکرن .

د . کامیران بەدرخان تێکوشەرەکێ سیاسی و روناکبیرەکێ ژێهاتی و مەزن بوو ، ژ بلی کوردیێ ، تورکی و عەرەبی و ئەلمانی و فەرەنسی و یۆنانی و ئینگلیزی و پۆلۆنی دزانی ، گەلەك بەرهەمێن هەین ل سەر ( رێزمان – چیرۆك – ئەلفوبێ ...... هتد ) هەر وەسا فەرهەنگەکا ( کوردی – فەرەنسی) و ( ئەلمانی – کوردی ) دانایه .

## لاوکێ من

**گاڤا کۆ فەرمانا کوردان ڕابوو ئەم هێژ نوو زەوجی بوون . شەڤەکێ تۆ پڕ درەنگ مای و گاڤا تۆ هاتی مال ، ددەستێن تە دە تڤەنگەکە نوو و چەند سەد بەرک هەبوون . دلێ من ترسیا و ڕەجفی ، من ژ تەڕە ب دەنگەکی لەرزی دگۆت**

**- گورگین .... دیسان چ هەیە ؟**

**تە ل من هیڤینا چاڤان و ب کەسەرا دلان مێزەکر ، پاشی ب دەنگەکی خورت ل من ڤەگەڕاند .**

**- داوەت دەست پێ دکە .**

دوەلاتی دە شەش مەهـ شەڕەکی زۆر چێبو ، ژن بی بوون ، زارۆک سێوی مان ، کورد دەسپێکێ دە دوژمن شکاند ، لێ پاشی ب بێ بەختی هاتنە شکەستن .

گاڤا تو دشەڕ دەبوویی ، من ژ تەڕە کوڕکەک ئانی ئێڤارکێ ، ئەز لبەر دەریێ مالێ سەکنی بووم ، چاڤێن من لێ ڕێ بوون . من دیت تۆ هاتی، هەردوو دەستێن تە بخوین بوون ، دسەر سینگاتە دە برینەکە کوور و ڤەکری هەبوو ، تە .. ئەز همێز کرم و نەکۆت عەسکەرێن دوژمن دسەر شۆپا من دە نە ، باوڕکە نهۆ ئەوێ بێن و من بگرن ، مەگری !!!

تنێ ڤی دەمی ژ بیرا مەکە . پاش تو ب گاڤێن لەز چویی سەر دەرگۆشا کوڕێ خوە ئێ پێنج مەهی ( تاجین ) و تە ئەو هلانی و ژیرا گۆت .

- تاجین !! دلێ تە ژ بوو نا ئاریکارییا کوردستانێیە . خویناتە ژ بوونا شەڕو ڕژاندنێیە . تە کوڕێ خوە دکر ناڤ دەرگۆشێ و عەسکەرێن دوژمنان دکەتن هندرێ مالێ ...

لاوکێ من ! ئیرۆ پێنج سال قەدیاینە کۆ ئەم ژ هەڤ دوور هاتنە ئێخستن . تۆ نهۆ دکۆر تالکێ دە ب سەد جامێرێن کورد ڕا دکەڤی .

خوە دزانە ... چەرمێ ڕوو وسنگاتە پر چفی و لاشێ تەڕزییایە .لێ گورگین . بزانە کۆ هەر شەڤ بەری هەڕە ڕاکەڤە کوڕێ تە تاجین زەند و دەستێن خوە ئێن تەڕ داڤێژە سەر ستۆیێ من و ب چاڤێن خوە ئێ زەلوول و ب کەسەر ل من مێزە دکە، من ماچ دکە ژ من ڕە دبێژە:

**- دایێ ! .... دایکا من باڤێ من ڕە بنڤیسینە کۆ مەزن بوومە . دلێ من ژ بۆ هەژکرنا کوردستانێیە . خورتییا ژ بوونا ئاریکارییا کوردستانێیە ، خوینا من ژ بۆ شەڕو ڕژاندنێیە !!!**

**لە ( د وەلاتی دە شەش مەھ شەڕەکی زۆر چێبوو ) لەبەر دەکرێ تا ( تەکوڕێ خوە دکر ناڤ دەر گۆشێ و عەسکەرێن دوژمنان دکەتن هندرێ مالێ )**

**د. کامیران عالی بەدرخان**

**هاوار ژمارە ( ٤ ) بەرپەڕ ٦**

**٣ێ تیرمەهێ – ئێک شەمب – ١٩٣٢**

## ڕاڤەکرنا پەیڤان

| | |
|---|---|
| شۆپ | : دەوس ، شوین پێ . |
| همێز | : همبێز ، باوەش کرن ، ئامێز . |
| دەرگۆش | : لاندك ، لانك . |
| پرچڤی | : نڤست (چرمسی ) . |
| کەتن هندرێ مالێ | : هاتنە ژوورڤە . |
| هندر : | : دناڤ دا. |

ژن بی بوون: بوونە، بی ژن.

مەگری : نەکە گری .

کۆرتالك : چال .

هلانی : ڕاکر، هەڵگرت .

ئاریکاری : هاریکاری .

قەدیاینە : بۆرینە / قەتیاینە .

بولتەنەك : گۆڤارەك وەرزیی .

مێزدەکە : دنێرێت ، سەحدکەتێ.

زەلوول : مل کەچ .

داڤێژە : ئاڤێتە : دهاڤێتە .

باڤ : باب .

هەژکرن : حەز ژێ کرن.

داوەت : شایی یە ( لێرە مەبەست پێ شەڕە ) .

# کاردۆخی
## ١٩١٦ - ١٩٨٢ ز



ناڤێ وێ یێ دروست ( محەمەد ئەمین کورێ کاکە شێخێ تەوێلەیی ) یە، کو هەر ل ( تەوێلە ) ل دەڤەرا ( هەورامان ) ل سالا ( ١٩١٦ ) ێ ز ژ دایك بوویە . دەستپێکێ خواندنا خۆ ل نك بابێ خۆ وەرگرتییە ، و پاشی چوویە قوتابخانێ . و بەردەوام بوویە ل سەر خواندنێ هەتا ل سالا (١٩٣٩) ێ ز بوویە مامۆستایێ سەرەتایی .

کاردۆخی ب خۆ خودان بەهرە و شیانێن باش بوویە بۆ ڤەهاندن و نڤیسینا هۆزانێ ، لێ دیارە ئەو ژی وەکو هەر هۆزاڤانەکێ دی کەفتیە بن کارتێکرنا چەند هۆکارەکان کو بەهرە و شیانێن وی بهێزتر و بەرفرەهتر لێ بهێن ، ژ بلی ڤێ چەندێ حەزژێکرن و ئەڤینی ژی ژێدەرەکێ دی یێ بەهرە و ئیلهاما وی یا شیعری بوون . و هەر وەسان جوانیا سرۆشتێ کوردستانێ ژی هۆکارەکێ مەزنێ ئیلهاما وی بوو .

کاردۆخی دهەلبەستێن خۆدا رێکا نیشتمانپەروەری و دلداری گرتییە ، ب دوو شێوەیێن زمانی هەلبەست هەنە ، ب کرمانجییا خوارێ و ب هەورامی . دیوانەکا چاپکری هەیە ب ناڤێ ( دیوانی کاردۆخی ) . ل سالا ( ١٩٨٢ ) ێ ز وەغەرکرییە ، دەمێ لەشێن شەهیدان دیتین ل حامیا سولەیمانییێ هۆزانەك دانەیە ب ناڤێ ( پیرێکی زانا ) ، کو ب زارێ ( هەورامی و کرمانجییا خواروو) د دیوانا ویدا بەرچاڤ دکەڤیت .

# پیرێوی زانا

پیریۆ ریــــش چەرمـــە ، دونیـــا دیدەو ڕاس
زانا و فامیدە تەمــــام پیـــا خاس
ئاماو ، دیش وەچەم ، کەش و کۆو ســـــارا
قەبرۆ شەهیدا ، جەدەگاو و شارا
دیــم ، هـــەڕەش پیمـــا ، تـــا واچی فـــری
گرەوی و نالێ دەنگی بەرز چڕی
بە کـــام نەیـــاوێ چـــی کـــوردســـتـــانە
یەکجار فرێنی چی گۆڕستـــانە
خـــەفـــەتـــی فـــــرەم پەی ئانیشـــــانە
بە دەست و وێما ، نریەی نیشـــانە
ئـــازاو گـــەنجێما ، زیـــاد جەســـــەدی
کریێ دارەرە ، بە دەســـــت و بەدی
پیـــــرە شــــیعرا وانـــێ و گـــــــرەوێ
تاسۆش بیوە ، چاگە مەرد شـــەوی

( ژ دەسپێکێ سێ دێر بۆ ژ بەرکرنێنە )
دیوانا کاردۆخی : چاپا ئێکێ ١٩٧٨ بەغدا

## ڕاڤەکرنا پەیڤان

| | |
|---|---|
| فرێ | : زۆر ، پتر . |
| گرەوی | : دگریا . |
| چڕی | : هەوار کرن . |
| نەیاوێ | : نەگەهشتی . |
| پەی | : بۆ وی |
| ئا نیشانە | : بۆ ئەوانە . |
| ویما | : خۆمان . |
| نریەی | : هاتە دانان . |
| گەنجێما | : لاوی ، گەنجی . |
| بەدی | : خراپی . |
| ئاسۆش | : ئاگەهـ ژ خۆ نەما . |
| چاگە | : ل ویرێ . |
| مەرد | : مر . |

# سادق بەهائەدین

## ١٩١٨ - ١٩٨٢ ز



ل سالا ١٩١٨ ز ل باژێرێ ئامێدیێ ژ دایك بوویە، ل بەراهیێ ب خواندنا ئایینی دەست پێکرییە، پاشی چوویە قوتابخانێ ، قۆناغێن خواندنا سەرەتایی و ناڤنجی و ئامادەیی سەرکەفتیانە بۆراندینە ، ل خانەیا بلند یا مامۆستایان ل بەغدا هاتە وەرگرتن ، و ل سالا ١٩٤٤ز دەرچوویە ، و بوویە مامۆستا ل قوتابخانێن ناڤنجی و ئامادەیی ، دەمەکێ زۆر ل گەلەك باژێرێن عێراقێ مامۆستا بوویە.

ڤی نڤێسەری هەر د کەڤندا خۆ ب خواندنا گۆڤارێن ( هەوار ) و ( گەلاوێژ ) مژویل دکر ، ڤان گۆڤاران کارتێکرنەکا زۆر کرنە سەر رەوشا وی یا روناکبیری و ژێدەرێ هاندانا وی بوون بو نڤیسینێ . گەلەك گوتار و نڤیسین د گۆڤار و رۆژنامێن کوردیدا بەلاڤەکرینە ، ئەندام بوو ل کۆڕێ زانیاریێ کورد و دەمەکی ژی وانەبێژ بوو ل پشکا کوردی ل کۆلێژا ئادابێ ل زانکۆیا بەغدا . ل سالا ١٩٨٢ ز چوو بەر دلوڤانیا خودێ ، بەرهەمەکێ زۆر لدویڤ خۆ هێلایە ، یێن گرنگ ئەڤە بوون : -

١- ئیدیەمێت کوردی ١٩٧٣ .

٢- دیوانا مەلایێ جزیری ١٩٧٧ .

٣- دیوانا پرتەوێ هەکاری ١٩٧٨ .

٤- نەو بەهارا سەیدایێ مەزن ئەحمەدێ خانی ١٩٧٩ .

٥- هۆزانڤانێت کورد ١٩٨٠ .

٦- خان و مان ١٩٨١ .

٧- مەولیدا مەلایێ باتەیی ١٩٨٢ .

٨- ڕێزمانا کوردی .

**ئەڤە ژی نموونەکە ژ نڤیسینێن وی .**

**((سیامەند بازرگانەکێ مەزن بوو ، گەلەک ب راهاڤێژ بوو . خەلکێ بازێری ب جارەکێ سەر تێ دکر ، هەمی پێدڤیێن خۆ ژێ دکڕین ژ بەر کو مرۆڤەکێ راستگۆ ، چاڤ ڤەکری ، ئاخفتن خۆش، دەستگر ، خێر خازو جامێر بوو ، دلێ کەسێ نەد هێلا دەست گرتن دگەل ژارو دەست کورتان دکر ، ژ بەر ڤێ چەندێ گەلەکێ ژ جهێ خۆدا ناڤدار بوو ، بەلێ لسەر جامێری و خۆش مرۆڤیبا وی ژی ڕا ، خودێ ژ رەنگ نەدیتبوو چو بچوویک نەبوون )) .**

**( تنێ بۆ خواندن و ڕاڤەکرنێیە )**

# سوارەی ئیلخانی زادە

## ١٩٣٧ - ١٩٧٦



ئەڤ شاعرێ نویخازێ رۆژ هەلاتا کوردستانێ ناڤێ وی ( سوارە ) یە و ( کورێ ئەحمەد ئاغایێ ئیلخانی ) یە ، ل باژێرێ بۆکان هاتییە دونیایێ ، خواندنا سەرەتایی و ناڤنجی ل سەقز و بۆکان و تەهران تەمامکرییە ، و پاشی چوویە کولیژا ماف ل زانکۆیا تەهرانێ .

( سوارە ) تنێ د ژیێ زارۆکینییێدا خۆشی برییە ، پشتی وێ و ژ بەر نەخۆشی و بن دەستیا نەتەوەیا وی گەلەك ب خەم و کۆڤان دکەڤیت . ل سالا ( ١٩٦١ ) بوویە ئەندام ل ئێکەتیا خوێندکارێن کورد ل زانکۆیا ئیرانێ .

د هێرشەکا مەزنا گرتن و راهێنلانێ یا پولیسێن ( شاهـ ) ی ، ( سوارە ) ژی هاتە زیندانکرن ل پشکا گرتیخانا سیاسی ل ئیرانی .

پتریا هۆزانێن ( سوارە ) ی بەحسێ دلداری ، کۆمەلایەتی ، نیشتمانیێ دکەن ، و ب دوو شێوا یێ کەڤن و نوی هۆزان ڤەهاندینە ، ب راستی هۆزانێن وی گەلەك تەڕ و شرین و رەهوانن و ب پەیڤێن جوانێن کوردی هۆزانێن خو ڤەهاندینە ، ژ بلی پەخشان و هۆزانێ (سوارە ) ی چەند چیرۆك نڤیسینە وەك : لاس و غەزال و ئافرەت و سەیدەوان و قاسپەی کەو .

( سوارە ) ی ئیلخانی ل ژیێ سیهـ و نەهـ سالیێ و ل سالا ١٩٧٦ ل تەهرانێ دچیتە بەر دلۆڤانیا خودێ و تەرمێ وی دبەنە بۆکان ، و ل وێرێ دهێتە ڤەشارتن .

# شـــــار

گولم . دلم پڕە ل دەرد و کوڵ
ئەلێم بڕۆم لە شارەکەت
ئەلێم بە جامی ئاوی کانیاوی دێیەکەم
عیلاجی کەم کولی دلی پڕم لە دەردی ئینتیزارە کەت
وەڕز بوو گیانی من لە شار و هاڕە هاڕی ئەو
لە ڕۆژی چلکنی نەخۆش و تاو یادی شەو
ئەلێم بڕۆم لە شارەکەت
لە شاری چاو لە بەر چرای نیئۆن شەوارەکەت
بڕۆمە دێ کە مانگە شەو بزێتە ناو بزەم
چۆن بژیم لە شارەکەت
کەپڕ بە دڵ دژی گزەم
لە شارەکەت ، کە ڕەمزی ئاسن و منارەیە
مەلی ئەوین غەوارەیە
ئەڵێی ل دەوری دەست و پێم
ئەوەی کە تێل و تان و ڕایە ڵە ، کەلەپچەیە
ئەوەی کە پەیکەرە میسالی داوەڵە
لە شارەکەت کەمەندی دووکەڵە
کە دێتە دەر لە مالی دەولەمەند
بە دارە تەرمی کووچە تەنگەکانی شارەکەت

**رانەهاتووە لەشم**

**بناری پڕ بەهاری دێ**

**ڕەنگی سوور و شین ئەدا**

**لە شیعر و عاتیفەی گەشم**

**ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت گوڵم**

**(بتنێ سێ دێڕێن ئێکێ بۆ زبەرکرنێنە)**

## راڤەکرنا پەیڤان

گوڵم : خوشتڤیا من .

نویخاز : رێبازا نوی .

کول : ئێش و ئازار .

تاویاد : تاوولەرز .

نیئۆن : گلوپا نیونێ .

شەوارە : روناهیەکا دژوار کو چاڤ ژ بەر ڤەنابن .

بزێتە : ب زێت ، دەرکەڤێت .

گزە : خوشی و شادی .

ئەوین : ئەڤین .

غەوارە : بیانی ، نەنیاس .

داوەڵ : کالکەکا مەزن ، پیلاڤەکا مەزن .

کەمەند : زنجیر ، وەریس کو خەلك پێ دهێنە گرتن .

عاتیفە : هەست .

# ئەحمەد دلزار




ناڤێ وی ( ئەحمەد کوڕێ موستەفا حەمە ئاغایێ حەوێزی ) یە ، ل سالا ( ١٩٢٠ ) ل باژێرێ کۆیە ژ دایك بوویە ، هەر ل دەسپێکا ژیانا خۆ حەز ژ خواندنێ کرییە ، دژیێ لاوینیا خۆدا کەفتە خەباتا نیشتمانپەروەریێ ، ب ڤێ رێکێ زیندان و ئێش و ئازار و ئەشکەنجەدانەکا زۆر دیتییە ، شاعرێ خەبات و ژیانێ گەلەك باش د وێ گەهشتییە کو دڤێت خەبات بۆ مللەتی بیت ، ژ بەر هندێ دێ بینین کو شعرێن خۆ دئێختە چارچۆڤەکی وەسایێ شعرێ کو پتریا زەحمەتکێشان تێبگەهن ، و بکەنە ستران، و سروودا کاروانا خەباتا خۆ، وەك دبێژیت :

**کارکەرین جەنگاوەرین ڕەنج بەرین تێکۆشەرین**

شعرێن وی بەحسێ مێژوویەکا خویناوی یا رێکخراوا تەخا کرێکارێن عێراقێ ب گشتی و کوردان ب تایبەتی دکەت ، چنکو دلزار دناڤ وێ ژیانا دژوار دا پەروەردە بوویە ، دلزاری دەستەکێ بالا هەبوو د وەرگێرانێدا، ئەڤەژی ژ ئەنجامێ زیرەکی و شارەزایا شاعریە د زارێن کوردی و ئەدەبێ بیانیدا ، گرۆڤێ مە ژی بۆ وێ چەندێ : –

١– گەنجینە :– کۆمەڵەکا چوارینێن بابە تاهیرە کو ژ شێوێ لوڕی کرییە زارێ کرمانجیا خوارێ .

٢- پێکەنینی بەهار :- پشکەکە ژ وەرگێرانا شعرا شاعرێ بناڤ و دەنگێ فەرەنسی ( ڤیکتۆر هیگۆ ) بۆ سەر زمانێ کوردی کو دەسپێکا وێ دبێژیت:

واگەڕانەوە ڕۆژە درێژەکان      بەجۆش و خۆشی ڕووناکی پەخشان
ئەمەیە بەهار ئازار و نیسان      هاتن پێکەوە ڕوو خۆش خەندان

دوو بەرهەمێن ئەحمەد دلزاری هاتینە چاپکرن ب ناڤێ ( ئاوازی ئاشتی ) و ( خەبات و ژیان ) . دلزار هەر ئەو شاعر نینە کو شعرێن وی هەر بۆ مەرەما سیاسی هاتبنە تەرخانکرن ، بەلکی شاعری سروشت و بەهار و دیمەنێن جوانێن کوردستانێ ژی کرینە هێڤێنێ شعرێن خۆ ، ئەڤ هەستێ نازك و سۆزا بەرزا شاعری ، د شیعرا ( مانگی گولان ) دا دەردکەڤیت :

## مانگی گوڵان

مـــــانگی گـــــوڵانە گـوڕەی بەهـــــار
زەمیـــن ســــــەراپا بـــاخ و کـــــوڵزارە
مــــافووری ســـــەوزی هــەردان گوڵ گوڵە
گــــــوڵشـــــەن بەجــــارێ پڕ لە بــولبولە
ســەراپـا شـــــاخ و بـــــاخ و دۆڵ و دەشت
چـــاو ئەنـــــدازێکن لە باخچەی بەهەشت
پۆلێ کــــــــەنیشــک و دەســـتەی دڵداران
هـــــــاتو چۆیــــانە لە نێو گـــــوڵزاران
منـــــــدالی ورد وێنـــــــەی کــــــــارژۆڵان
پەرت و پەخشــــانن لە نـــاو مێرگــــوڵان

گەلەی گاکێوی و کەروێشک و ئاسکان
پەرتـــانن بەدەم هـەڵدێر و باسـکان
ئاوی کانیـــا وی ســـارد و سازگـــار
لـــە ژێر و قەدی کـیـێوان دێتە خـــوار
لـــە لایێ شـــەپۆڵ شڵە شڵپ ئەکـــا
لە لایێ ئـــاگـر کڵپە کڵپ ئەکـا
لایەکـــیش گـــردو هـەورازو ڕازە
دامێنی جێگـــەی یـــاریی ســـێبازە
ورد و درشـــــت و کـــچ و ژن و ژاڵ
منداڵ و گـــــەورە ، پیاو و کوڕ و کاڵ
گشتی سەرخۆشی جوانیی ســـــروشتن
بەرانبەر نەغمـــەی بـــولبولان وشـــتن

( سێ دێر بۆ ژبەرکرنێنە )

## ڕاڤەکرنا پەیڤان

مانگی گوڵان : هەیڤا نیسانێ .
گوڕەی بەهار : گەشبوونا بەهارێ .
چاو ئەندازە : دیمەنکێ دلڤەکەر.
پۆلێ کەنیشک : کۆمەلەکا کچان .
پەرت و پەخشان : بەلاڤ بووینە .
ئاسکان : ئاسك ، غەزال .
باسکان : باسك ، باسکێ چیا .

کلۆپە ئاگر : گوریا ئاگری .
سێبازە : سێگاڤ ( یاریەکا کوردەواریە )
وشتن : هەستیارن .
هەردان : ئەرد .
گوڵشەن : گوڵزار .
گەلە : گە لە ك
پەرتانن : بەلاڤن

**بۆزانین :-**

**ناڤێن مەهێن کوردی بێن شێوەزارێ کرمانجیبا ژووری :-**

١- **وەرزێ بەهارێ :-** نەوروز ، نیسان ، گولان .
٢- **وەرزێ هاڤینێ :-** خێڤە ، تیرمەه ، گەلاڤێژ .
٣- **وەرزێ پاییزێ :-** کەوچەرین ، چریا ئێکێ ، چریا دووێ .
٤- **وەرزێ زڤستانێ :-** بەفر بارانا ئێکێ ، بەفر بارانا دووێ ، ڕەشەمێ .

**ناڤێن مەهێن کوردی بێن شێوەزارێ کرمانجیبا خوارێ:-**

١- **وەرزێ بەهارێ :-** نەورۆز ، گولان ، جوزەردان .
٢- **وەرزێ هاڤینێ :-** پووشپەر ، خەرمانان ، گەلاڤێژ .
٣- **وەرزێ پاییزێ :-** ڕەزبەر ، گەلا ریزان ، سەرماوەز .
٤- **وەرزێ زڤستانێ :-** بەفرانبار، ریبەندان ، ڕەشەمێ .

## ئەو ژێدەرێن بۆ نڤیسینا هەردوو بابەتین

## رێزمان و ئەدەبێ مفا ژێ هاتیە وەرگرتن :

١- رێزمانی کوردی - ناو ، د . ئاورەحمانی حاجی مارف

٢- ئاواو دەستوورا زمانێ کوردی ، جگەرخوێن

٣- رێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، کۆڕی زانیاری کورد

٤- رێزمانی کوردی ، صادق بهاالدین

٥- رێزمانی کوردی ، پ ، کوردۆیێف ، د . کوردستان موکریان ژ روسی کریە کوردی .

٦- رێزمانی کوردی ، نوری عەلی ئەمین

٧- دیوانی پێنچوین ، کۆمکرن و ئامەدکرنا ، ئومێد ئاشناو عبدالکریم موفتی

٨- یادی موفتی ، کۆمکرنا بورهان قانیع

٩- ئەسیری شاعیرێکی شۆڕشگێری ، قوناغی دوای حاجی قادری کۆییە ، جەبار جەباری .

١٠ - سەرجەمی بەرهەمەکانی : شەهید مارف بەرزنجی ، کومکرن و رێکخستنا سامان مارف بەرزنجی و عمر معروف بەرزنجی .

١١- دیوان دلدار .

١٢- دیوانی کاردۆخی .

و کەلەک ژێدەرێن دی ژی ........

# ﴿پشكا خواندنێ﴾

١ - شێخ مەحموودێ نەمر .

٢ - هەردەم ب ژیانی پێبكەنە .

٣- زانست تشتێ سەیر ڤەدبینیت .

٤- مۆسیقا .

٥ - چەوا دێ خوینی و دێ چ خوینی ؟ .

٦- شكەفتا شانەدەر .

٧- ئەدیسۆن .

٨- ئێكێ ئەیارێ .

٩- هەلەبجەیا شەهید .

١٠ - شۆرەشا مەزنا ئەیلولا ١٩٦١ ز .

١١ - خێزانەكا ئاوارە .

١٢- بەردە قارەمان .

١٣- دهۆك .

١٤- ئافرەتا كورد .

١٥- میدیا .

# شێخ مەحموودێ نەمر

ژ گۆتارەکا ( مەحمود ئەحمەد )

ب دەستکاری

نامەوێ ژینی ئەسارەت ، بەسمە عومری گومرەهی
نای کەمە سەرخۆم بەدەستی مودەعی تاجی شەهی
قەت بە ئەمری دوژمنـانم نامەوێ فەرمـاندەهی

نوربەخشی[1]

(( ... لە ناوچەی پیلان و پرۆژەی چەپەڵی بێگانەدا ، کە وەك دوومەڵی تەقیو لەم سەر بۆ ئەو سەری وولات زووخاویان لێ دەتکا ، ئەو وولاتەی کە شەڕو چاوچنۆکیی ئەوان لە پەل و پۆی خستبوو ، هەمیشە بەبێ ئاسوودەگی و حەسانەوە و چەمانەوە تێ دەکۆشاو بێ ووچان بۆ پێشەوەتر و بەبێ کۆڵدان بەرەو ئامانجی پیرۆزی خۆی و گەلەکەی کە ئازادکردنی کوردستان ئازیز بوو هەنگاوی دەناو پەلی دەهاویشت ، بێ ئەوەی بسلەمیتەوە ، هەر بەو ئایینەوە حەفتا ساڵی بردە سەر، کە مێژوو شاهیدی لاو چاکی و هونەرمەندی و قارەمانیی ئەو ساڵانەی خۆی و گەلەکەیەتی .

بپرسە لە سوپێرەکانی ( ناڵەشکێنی ) لە بۆکان و ئێسك و پۆستی سۆلداتی قەیسەری رووس ، بپرسە لە هۆڕاوو دەشتەکانی شوعەیبە و

(١) (نوربەخشی ) نازناڤێ شاعیرانەیی شێخ مەحمودێ نەمر بوو ، ب کوردی و فارسی شیعر هەیە .

لاکی بۆگەنی تۆپیوی ئینگلسی نەگریسی نامەرد . بپرسە لە پیران و مەریوان . بپرسە لە سورداش ، ئەشکەوتی جاسەنەو فرۆکە ڕەشەکە .بپرسە لە دەربەندی بازیان و دەشتە تاڵ و گرێزە و کەناروێ و ئاو باریك . بپرسە لەو بۆمبە هەرە گەورانەی ئەو زەمانە . بپرسە لە شاخ و کێوو دۆڵ و شار و دارستان و ئەشکەوتەکانی کوردستان و مێژووی دوژمنانی خوێن ڕێژ وەلامت ئەدەنەوە . بۆتی دەرئەخەن کە چ پاڵەوانێك بوو ، چ ڕۆڵەیەکی کورد بوو، کە کوردستان شانازیی پێوە بکا ، تاکو ماوە ناحەق نییە ، ئەگەر وەلامت وەرنەگرتەوە بپرسە لە ( بەردەقارەمان ) ، لە هیندستان و کوێت و بەغدا و ناسریە و رومادی و داریکەلی ، کە تا چ ڕادەیەك تواناداروو لێبڕاوو خۆراگرو نەچەماوەبوو . بپرسە لە ساڵی ١٩١٨، قارەمانی سۆڤێتی مارشال ( بۆدیۆنی ) وەلات ئەداتەوە ،کەوا بۆچی پەناو هانای بردە بەر شۆڕشگێڕانی ئۆکتۆبەری مەزن کە داوای یارمەتی و کۆمەکی لێ کردن ، پێت دەڵێت، بۆ ئازادکردنی کوردستان بووە .

بپرسە لە کارەساتی مووسڵ ، بۆت دەگێڕێتەوە کە ئەو خوێنە پاکانە چۆن لە ڕێی ئازادیی کوردستان و سەربەخۆیی و وەلات پەرستی دا بەدەست دوژمنی ناڕەزا بەو ئایینە بە ناحەق ڕژێنرا .

بپرسە لە سەرۆکی دادگای سوپای ئینگلیز لە ٢٥ی تەموزی ١٩١٩ دا بۆت دەگێڕێتەوە بۆ چ فەرمانی بە خنکاندنی ئەو قارەمانە نەمرە دا پێت دەڵێت لە بەر ئەوەی داوای ئازادی کوردستانی دەکردو

ڕێگەی نە ئەدا سوپای ئینگلیز و خوێن مژەکانی دەم بنێنە سامانی وولات جەرگی گەلی کوردەوە .

بپرسە لە مەیدان و بانە و دۆزەخ دەرەوە نەڵێن و کۆنە شار و خۆی و سەلماس و چاریە و دەشتی مەرگەوەڕ و تەر گەوەڕو لاجان ، بەڵێ بۆچی ماڵ و منداڵی شیخ مەحموودی پێوە بەستراوانیان گەیشتنە لای ئێوە ؟ وەلامت ئەدەینەوە، ئەگەر هەر نەبوو زێوەری شاعیری کورد ئامادەیە وەلامت بداتەوە ، چونکە لە گەڵیان بوو .

پێت دەڵێت لەبەر داواکردنی ئازادی و سەربەخۆیی خواستن و رازی نەبوونی داگیرکەرانی ئینگلیز بوو واما ن بەسەر هات .

بپرسە لە نەخۆشخانەی بەغداو بڵێ : بوچی ئەو قارەمانەتان بە پیری و چوونە سالی عومرەوە کوشت ؟

( بپرسە لە رژێم نۆکەرو یا ساوڵ کە بۆ چ تەرمی نازداری ئەو رابەرەتان گوللە باران کردو بە مردوویی بریندارتانکرد ؟ ) بۆت دەگێڕنەوە کەوا ( لە ژیان و مردندا ) ترسێکی گەورە کۆسپێکی سەخت بوو لە ڕێی ئازاردان و چەوساندنەوەی بێ نەوایانی کوردا ، کەوایان دەزانی بەوە ڕێیان بۆ بەرڵلا دەبێت، دەتوانن بکەونە جلیت بازی. بە بیریانا نەدەهات کە ئەو زنجیرە دەپچرێت و ئەلقەکانی لە یەك دەترازێن و شۆڕشی چواردەی تەموززی دێتە بەرەوە تەخت و تارجیان تێك ئەدات. بەڵێ قارەمانی نەمر، ڕۆڵەی نەتەوەی کوردی نەبەزو چقلی چاوی دوژمنان، بە ئاوێکی ڕشتی کە تا وەلاتێکی ئازاد و گەلێکی شادی پێ

دەگات وشك نەبێتەوە ، مێژووی كوردی سەربلند و خاوێن كردەوە و هیواو ئایینی گەلی تازە كردەوە .

ئەگەر بەهۆی زوڵم و زووردارییی داگیركەران و ناتەواوو خۆ پەرستەكانی ناوخۆی نۆكەرو هەڵكەوتی جوگرافیی وەلاتەیەوە سەرنەكەوتبێت و نەگەیشتبێتە ئامانج و غەدر لێ كراو سەری نابێتەوە . هەر گیز غەدر ناتوانێت لە شەخسیەتی ئەو كەم بكاتەوە و ئالایەك كە هەڵی كردووە بینەوێنێ . ئەو ئالایە هەمیشەو بە درێژایی ژیان و مێژووی كوردستان بە بەرزییەوە دەشینێتەوەو بە شانازی و یەر بلندی بەهیواو سروودی خۆشنوودی كورد دەلەرێتەوە .

تا كوردیش ما بێت ، یادی ( شێخ ) ی نەمر و قارەمان لە دلیدا دەمێنێت و كە سەیری شاری هەڵەت و قوربانی دەكات ، دێرە شیعرەكەی ( حەمدی) دەڵێتەوە :

**وەک مەدینە بێ نەبێ بێ ، یا نەجەف بێ بێ عەلی**
**شاری ( غەزنە ) ش ئێستە بێ مەحموودە وەک داریکەلی**

## ڕاڤەکرنا پەیڤان

| | | |
|---|---|---|
| ناوچە | : | هەرێم ، دەڤەر . |
| چەپەڵ | : | پیس ، قرێژی . |
| بێگانە | : | بیانی . |
| تەقیو | : | پەقی . |
| چاوچنۆکی | : | رەزیل ، چاڤ برسی . |
| ئاسودەگی | : | تەناهی . |
| بێووچان | : | بێ وەستیان ، بێ بێنڤەدان . |
| بۆ پێشەوەتر | : | پێشڤەتر . |
| ئامانج | : | ئارمانج . |
| هەنگاو | : | پێنگاڤ . |
| بسلەمێتەوە | : | ڤەچنقی . |
| پێوە بەستراو | : | پێڤە گرێدای . |
| ئاین | : | ڕێگە ، رەوشت . |
| سوپێر | : | سەنگەر . |
| ئێسك | : | ئێسقان هێسك ، هەستی . |
| پۆست | : | پێست ، چەرم . |
| سوڵدات ( ب ڕووسی ) | : | سەرباز. |
| لاك | : | کەلەخ . |

| | | |
|---|---|---|
| تۆپیو | : | فەتسی ، مرار بوو . |
| واشە | : | تەیرەکێ مەزنە وەك بازی یە . |
| شاخ | : | چیا . |
| دۆڵ | : | نهال . |
| شار | : | باژار ، باژێر . |
| ئەشکەوت | : | شکەفت . |
| خۆڕاکر | : | خۆراگرتی . |
| کۆمەك | : | یارمەتی ، هاریکاری . |
| بڵێ | : | بیژە . |
| ئامادەیە | : | بەرهەڤە. |
| بێ نەوایان | : | بەلەنگازان . |
| هەڵکەوت | : | بار ، وەزع . |
| لە پەل و پۆی خستبوو | : | ژ بزاڤ و لڤینێ ئێخست بوو . |
| بۆتی دەرئەخەن | : | بۆتە ئاشکرادکەن . |
| وامان بەسەر هات | : | هوسا ب سەرێ مە هات . |
| جلیت بازی | : | جۆرە یارییەکە . |

## دان و ستاندن :

١) دڤێ نڤێسینێدا ناڤێ گەلەك جهان هاتییە ، هندەك ژ وان ل كوردستانا عیراقێ نە ، و هندەكێن دی ل باشورێ عیراقێ ، و هندەكێن دی ل كوردستانا ئیرانێ و هندەك جهێن دی . ئەڤان ناڤان چ پەیوەندی ب مێژوو و خەباتا شێخێ مەزن ڤە هەیە ؟ ژ مامۆستایێ خۆ بپرسە .

٢) هۆزانا كیژ هۆزانڤانی تە ژ بەرە كو باسی شێخ مەحموودێ نەمر بكەت؟ د پەرتووكخانا بازێرێ خۆدا لێ بگەرێ .

٣ ) نڤێسەر د ئەڤی دەقیدا كارێ ( بپرسە ) دادنیتە پێشییا ڕستێ ،ددەمەكیدا پێدڤی یە كار بكەڤیتە پاشیا ڕستێ د ڕستەیا زمانێ كوردی دا ،تۆ دزانی بۆ چی ؟

بۆ وێ چەندێ یە دا گرنگیێ بدەتە وێ پسیارێ ، ڤیجا تۆ ژ مامۆستایێ خۆ بخوازە كو پتر ل سەر ڤێ پێشی و پاشیێ باخڤیت .

## هەردەم ب ژیانێ پێبکەنە

ئەگەر یێ رووخۆش بی ، و ل بەرامبەری ژیانێ بکەیە کەنی ، و هەردەم یێ رووناك و گەش بین بی ، هیڤیا ب دەسڤەئینانا ئارمانجان دێ پەیداکەی ، و دێ پشتاتە ب سەرکەڤتنێ موکم بیت ، و بۆ خێر و خۆشیا خۆ و یا خەلکی باشتر دێ هزرێ کەی ، لێ ئەگەر یێ ڕوو نەخۆش و ئەنی گرێ و پوسیدە بی، و هوسا بزانی کو دنیا یا ب سەرتەدا کەڤتی ، هەردەم یێ تاری و رەش بین بی، ئارەزوو و هیڤی و ئارمانجێن تە ئێك ل دویڤ ئێکێ دێ مرن ، و هەردەم دێ یێ لەنگ و کێم بزاڤ بی ، و دێ سەرێ تە یێ تێك شێلای بیت . و ب ڤی رەنگی نە تۆ خێرو خۆشیێ ب خۆ دبەی و نە خەلك ژی سوود و مفای ژ تە وەردگرن ، بەلێ ئەو کەسێن هەردەم بۆ ژیانێ دگرنژن کارێن هەرەمەزن ب دەستڤەدهێن ، چونکە نە تەنگاڤی و ئالۆزی ئەوان سست دکەن ، و نە بارێ گرانێ ژیارا رۆژانە دەست و پێت وان گرێ ددەن .

باوەربکەن ئەگەر ڤێگاڤێ ژمن بپرسن : تە پارە و مالێ دنیایێ دڤێت ، یان دلنیایی و دل و دەروونەکێ ب کەیف و روویەکێ گەش و دەڤەکێ بگرنژین ، ئێکسەر بێی گیروبوون دێ بێژم دلنیایی و رووگەشی . چونکە پارە و مالێ دنیایێ دگەل خەم و دلتەنگیێ بۆ چی یە ؟ چ ل پلەیێن بلند بکەم ئەگەر هەردەم دلتەنگیێ ئەز داگیرکربم ، و دلێ من هاتبیتە گڤاشتن ، و وەکو پاپۆرەکێ ل بن ئاڤ بیت .

هوین سەحکەنە دەیکەکا ب خەم و کۆڤان و ناڤ چاڤ گرتی دماڵەکێ دا ، دێ وێ مالێ کەتە دۆزەخ ، لێ ئەگەر ئەڤ دەیکە یا ڕووخۆش و گەش بیت ، سنگ فرەهـ و دلڤەکری بیت ، ب دەڤەکێ بگرنژین بیت ، دێ وێ مالێ کەتە بەهەشت ، و دێ بیتە گولەك دناڤ باخچەکێ جوان دا .

هوین سەحکەنە گول و گولزار و کارك و بەرخ و چیچك و سویسك و بولبول و زارۆیێن هەستی سڤك و جوان و سەحکەنە سیلاڤ و چیا و دەریا و شەپولێن گولیێن گەنمی ، ئەگەر سەکرنا هەوە ب روویەکی گەش بیت و ب سەروچاڤێن ڤەکری بیت دێ جوانی هێتە بەرچاڤ، لێ ئەگەر ب دلەکێ تەنگ و بناڤ چاڤ گرتی بیت چ جوانی ناکەڤتە بەر چاڤێن هەوە .

ئەگەر تە بڤێت ب رووگەشی و دەڤەکێ پڕ گرنژین بژی ، پێدڤی یە هەردەم بەرنگاریا دلتەنگیێ و نەخۆشیێ و رەش بینیێ بکەی ، و وێ ژی بزانە دەمێ دکەڤیە کارکرن و ب بجهـ ئینانا کاروبارێن خۆ پێدڤی یە ب دلەکێ ڤەکری و ب گەش بینی و ب ئومێدا سەرکەڤتنێ دەست پێ بکەی ، و دەلیڤێ بدەیە خۆ و بێهن فرەهـ بی دا کو پشکوژا هیڤی و ئومێدان د دل و دەروونێ تە دا شین ببیت ..و گەش بیت ، و پیدڤی هەردەم چاڤەڕیێ کارێ باش بی نەك یێ خراپ .

ئەگەر هوسا هزرکەی کو تۆ چ نینی و تە چ شیان نینن ، و چ ب دەست تەڤە ناهێت ، هینگێ دێ پاشکەڤی ، و نەشێی چ پێنگاڤێن بەرەڤ پێش بهاڤێژی ، لێ ئەگەر هوسا هزرکەی کو تە گەلەك تشت پێ چێدبن ، و تو ژ چ کەسێن دی کێمتر نینی ، هینگێ تۆ ب خۆ دێ هەست کەی کو تۆ کەسەکێ کارای و خۆدان شیان و هەبوونی ، و هەمی کارێن تە دێ دبیاڤەکێ ڕەوادا چن ، و چاڤێ تە ژ کاری ناترسیت ، و ژ هەمی ئاستەنگان دێ دەرباز بی . تۆ مەبەست و ئارمانجێن خۆ دەست نیشان بکە ، ڤێجا بلا د دوور و گران ژی بن ، هەر دێ گەهیێ ، چونکە هەر ڕۆژ دێ پێنگاڤەکێ بەر ب سەرکەڤتنێ هاڤێژی .

خۆدان دل و دەروونێن گەش و ڤەکری ئەوێن بۆ ژیانێ دگرنژن ، دەمێ کارەکێ گران و ئالۆز دبینن پێ دکەنن ، و دەست ب کاری دکەن ، و ب چاڤەکێ روون و ب روویەکی گەش و ب ئومێدەکا مەزن پێنگاڤان دهاڤێژن، و ب ئەڤێ چەندێ ئەو کار ل بەر سینگێ وان سڤك دبیت ، لێ خۆدان دل و دەروونێن رەش بین و بێهن تەنگ هەر کارەکێ ببینن هێز تێ نامینیت ، و پشتا وان دشکێت .

ب ڕاستی هندەکێن زۆر سەیر هەنە ، حەز دکەن سەربکەڤن ، لێ ب مەرجەکی هیچ شیانان نەمەزێخن ، و هیچ وەستیانێ نەبینن و هەر تشتەکێ وان بڤێت هەما ژ ئەسمانی بۆ بێتە خارێ ، یان ژ بن ئەردی دەربکەڤیت ، و ئەگەر ئەڤە ب دەست وان نەکەڤن دل تەنگ دبن ، و بێ بزاڤ دمینین ، وبێ گۆمان گەلەك ژ سەرکەڤتنێ د دویرن .

قوتابیێ خۆشتڤی ، هەر دەم ل بەرامبەرێ زاروکێ دلاندکێدا و ل بەرامبەر کرێکار و پالە و جوتیار و پیر و لاو و گەنج و کەس و کار و خوشك و برا و ناسیارێن خۆ بکە کەنی و ب هەمیان بگرنژە ئەگەر گیروگرفتەك و ئاریشەك هاتە رێکاتە سەرێ خۆ بۆ نەچەمینە ، و سنگێ خۆ ل بەر نەدانە ، هەردەم ب گرنژین سەحکە سەرکەڤتنێ ، و ل هەر چوار لایێن خۆ بگرنژە ، و وەکو گولەکێ بکە دناڤ واندا ، چونکە ئەڤە دبیتە هۆکارێ سەرکەڤتنێ[1] .

---

(١) ژ پەرتووکا خوێندنا عەرەبیێ یا پۆلا دووێ ناڤنجی هاتییە وەرگێران ب دەستکاری .

## دان و ستاندن :

١) بۆچی ئارەزوو ئارمانجێن مرۆڤی ب ناڤ چاڤ گرتیێ وەرش بینیێ دمرن ؟

٢) ئەرێ دێ شیێ کەنی و گرنژینا ب ترانەکێ و گالتەکێ ژ کەنی و گرنژینا خۆشتڤیێ و دلخۆشیێ جۆدا کەی یان نە ؟

٣) دبێژن دەمێ د کارەکیدا سەرنەکەڤی ژی هەر یێ دلنیا و ب گرنژین بە. ئەرێ ئەوێ گرنژینێ مفا هەیە ؟

٤) پێدڤی یە ب چ رەنگ سەرەدەریێ دگەل کارێن گران و ب ئاستەنگ بکەین ؟

## زانست تشتێن سەیر ڤەدبینیت

زانست هەمی ڕۆژەکێ تشتەکێ نوی ڤەدبینیت ، ڤەکۆلینێ و پشکینینێ ووردکاریێ دکەت و تشتێ هوسا نیشامە ددەت کو ئەم پێ سەرسوڕمان دبین ، تشتێ هوسا کو مە گوهلێ نەبووی ، یان ژی مە ب هەڵە دزانی . ئەڤ تشتە گەلەکن . گەلەك جۆرن ، ئەم هندەکان دێ ئێخینە بەرچاڤ.

## شینکاتی هەیە مۆسیقایێ بۆ لێ بدەی دێ هەلپەڕیت

دوو زانایێن هندی دکتۆر (سنگ ) و دکتۆر ( پایناها ) ، ئەڤە یا ڤەدیتی، هەمی سپێدەهیان بۆ ماوێ بیست و پێنج خۆلەکان مۆسیقا بۆ هندەك جۆرێن شینکاتی لێددان و دگەل ڤێ مۆسیقەلێدانێ ژی سەحدکرنە پرۆتۆپلازمێ ناڤ خانەیێن وان شینکاتیان ، دیتن کو دەمێ مۆسیقا دهێتە لێدان ئەو پرۆتۆپلازمە بلەزتر لڤینێ دکەن ، و دەمێ مۆسیقێ ڕادوەستینن ئەو پرۆتۆپلازمە وەکی خۆ لێ دهێتەڤە ، و لێڤینا ئاسایی دکەت .

ئەڤ شینکاتیێ تاقیکرن ل سەر هاتینە ئەنجامدان دبێژنێ ( مومۆزا ). دوو ژ وان دئێك ڕۆژدا چاندن ، و ئاخا هەردووان وەك ئێك بوو . وەك ئێك ژی خزمەتا وان دهاتەکرن ، لێ هوسا د ژێك دوور بوون دەمێ مۆسیقا بۆ ئێك ژ وان دهاتەلێدان دەنگ نەدگەهشتە یادی ، ل دوماهیێ دەمێ مەزن بووین، سەحکرنێ کو ئەوا مۆسیقا بۆ دهاتە لێدان جارونیڤا تەمەت یادی یا درێژ بووی.

ب شینکاتی ئەم دزانین چ کانزا ل بن ئاخێ هەیە ، دبێژنێ ( ئەفسنتین ) . ئەڤە ئەوە کو ( ئیبنول بەیتار ) ناڤ کرییە

ب ( دەمەسیسە ) ، ئەڤە ل هەر دەڤەرەکێ هاتبا چاندن ، ڕامان ژێ ئەو بوو ڤێ دەڤەرێ ( مەنگەنیز ) تێدا هەیە . هندك شینکاتی ژی هەنە ل هەر جهەکی بێنە چاندن ، رامان ژێ ئەڤەیە کو ل وێ دەڤەرێ ئاسن هەیە .

دەستەیەك ژ جیۆلۆجیێن کازاخستانێ ل وەلاتێ سۆڤێت ، جهەك ڤەدیت ، پڕی گولێن بنەفشوك بوو ، هزرکرن ل وی جهی دێ گاز هەبیت ، پشتی دەست ب لێگەڕیان و کۆلینان کرین بۆ وان دیاربوو کو هزر و بۆچوونا وان یا دروستە ، و گاز دیتن .

ئەڤ ڤەدیتنە نە تشتەکێ ڕێکەفتی بوو . چونکە ئەگەر بێینە راستیێ دناڤ بەرا شینکاتی و کانزای ئەو ئاخە ئەوا شینکاتی هێزو وزە و خوارنا خۆ ژێ وەردگریت پەیوەندیەکا موکم هەیە ، ژ بەرکو شینکاتی بۆ وەرارا خۆ پێدڤی ب کانزای هەیە دناڤ وێ ئاخێ دا هەبیت داکو شینکاتی باش بێتە بەرهەمی و جوان و سەرنج راکێش بێت .

## زێندەوەر هاریکاریا ئێك دکەن :

ئەوا هەتا ئەڤرۆ سەرنجا مە راکێشای ئەڤەیە کو زیندەوەر هەڤڕکیێ دگەل ئێك دکەن ، و هندك جاران ئێك و دوو ژێك ژێك دکەن . لێ ئەوا زانایان ڤەدیتی بەرۆڤاژی ئەڤێ سەرنجێ یە . و مەرج نینە هەمی زیندەوەر د وەسابن، ئەو زانایانە دبێژن هندەك زیندەوەر هەنە دژیانا خۆدا هاریکاریا ئێك دکەن بۆ نموونە دبێژن چیچکەکا بچووك یا هەی دەمێ نەهەنگ سەرێ خۆ ژ ئاڤێ

دئینته دەرێ و دەڤێ خۆ تەمام ڤەدکەت ، ئەڤ چیچکە دهێت ب دمێ خۆ دکەڤیتە وێ خوارنا مایە دناڤ ددانێت نەهەنگیدا و دخۆت ، ب ڤی کاری خۆ تێر دکەت ، و ددانێت نەهەنگی ژی پاقژ و بژین دکەت ، ئەڤ چیچکە ب ڤی کاری یا خۆشە ، و نەهەنگ ژی یێ ڕازی یە ، ژ بەر هندێ دەڤێ خۆ بۆ ڤەدکەت هەتا کو چیچك کارێ خۆ ب دوماهی دئینیت .

زانایان ل ئەڤێ دوماهیێ جۆرەکێ پێکڤە ژیانا ب خۆش و ئاشتیانە دناڤ بەرا دوو جۆرێن زێندەوەرێن ژێك جۆدا دا ڤەدیتیە ، ئێك ژ وان مێری یەکو هێرش دکەتە سەر ئادوییێن ئەمریکا ناڤەڕاست ، هەر چ ب دەست دکەڤیت دخۆت و دمالیت ، و جۆرێ دی بالندەیەکە کو بەری وی جۆرێ مێریا هێرشا وێ دەڤەرێ دکەت ، ئادویان دخۆت لێ تشتێ سەیر ئەوە کو دەستێ خۆ درێژ ناکەتە وی جۆرێ مێریا . هەر چەندە هندی بیژی خوارنەکا بژارەیە بۆ وی بالندەی هەر وەسان ئەو مێری بۆ لایێ وی بالندەی ناچیت ، هەر چەندە هێرشێ دکەتە سەر هەمی زێندەوەران و هەمیان پەریشان دکەت .

## چاڤەك ل ئەسمانی :

هەیڤێن دەست کرد چاڤکێن دەست کردێن هەستیار پێڤەنە ، ئەڤ هەیڤێن دەست کرد ب ڕێکا ئەوان چاڤکان دشێت وێنەیێن هەمی تشتان ل سەر ڕوییێ عەردی بگرن . هەر چ هەبیت ل سەر ڕوییێ عەردی ژ سوپا و فڕۆکخانە و جهێن صاروخ هاڤێژتنێ و جهێن کارگەهێن نەوەوی وێنەیێن هەمیان دگریت.

ئەڤە تشتەکێ ئاشکەرایە کو عەرد ل دۆر خۆ دزڤڕیت ، هەروەسان هەیڤێن دەست کرد ژی ل دۆر عەردی دزڤڕن . ژ بەرهندێ ئەڤ هەیڤێن هە ل ئێك جه نینن . و ژ هەمی جهێن عەردی دەرباز دبن و ب ئەوان چاڤکێن پێڤە وێنەیێن هەمی جهان و هەمی تشتان دگرن ، نە بتنێ ئەڤە بەلکو ئەوان وێنەیان دهنێرنە سەر عەردی بۆ وان زانایێن ڤەکۆلینێ ل سەر دکەن ، و چاڤدێریێ لێ دکەن .

ژ پەرتووکا خوێندنا عەرەبی

پۆلا دووێ ناڤنجی هاتییە وەرگێڕان

## ڕاڤەکرنا پەیڤان

پشکنین : لێ گەریان .

کانزا : مەعدەن .

نەهەنگ : حویت ، ( حووت ) .

## دان و ستاندن :

١) ب چ تاقیکرن هندەك زانایان زانی هندەك جۆرێن شینکاتی ب مۆسیقایێ وەرارێ دکەن ؟

٢) چەوا ب هندەك شینکاتیان ئەو بۆ مە دەردەکەڤیت ، کو ئەو ئاخا تێدا شین دبیت چ جۆرە کانزا تێدا هەیە ؟

٣) ئەرێ دێ شێی نموونەك دووا بینی کو تێدا هاریکارو پێکڤەژیانا زیندەوەران تێدا دیار ببیت ؟

٤) هندەك سوود و مفایێن هەیڤا دەست کرد بۆ مە بەحس بکە .

# مۆسیقا

ئەرێ مۆسیقا تو نابێژیە من تو چی ؟ تو سروودا سروشتی یان بەستەیا گەردوونی ؟ ئەز نزانم تو چی ؟ هەر هند دزانم کو ئاوازەك دهێتە گوهێ من و ئێکسەر دناڤ هەمی ئەندامێن لەشێ من دگەریێت ، هەر ژ کلوڤانکا سەرێ من دەست پێدکەت و ژ تبلا مەزن یا پێ من دەردکەڤیت ، ئاوازەکی دئێخیە د گوهێ مندا دەمارێن من ژ خۆشیێ مت دکەت و من دئێختە پێلا هەستەکێ خۆش خۆش . د خەیالا خۆدا ژ داڤێن نازکێن وی ئاوازی مەحفیرەکێ د چنم و داڤ و تێلێن وێ هەمی سۆز و هژیان بیت ، ئەڤجا هەر ب خەیالێ دێ سیاری وێ مەحفیرێ بم و دێ من بەت و دێ من بەت .........

ئەی مۆسیقا تو ویج ویجا بلبلی کو گیانی دسمیت و خوینێ دمێژیت[1] یان هاوار و مشێنا ئاڤا رووباری کو لایەلایا خەمە[2] بۆ یی بتنێ بشەڤێ .

---

(١) گۆران بو ( بلبلی ) دبێژیت :-

چۆن تو خوا چۆن ئەی بولبول

ئەی باڵداری بەهرە زل

ئەو گەروو بچۆڵانە

ئەو نەغمە بەرز و جوانە

چۆن دێتەدەر ، چۆن ئەرژێ

وا گیان ئەسمێ ، خوێن ئەمژێ

(٢) گۆران د گەشتا هەوراماندا دبێژیت : –

هاوار هاژەی کەف چوڕینی چەم　　　بو تەنیایی شەو ، لایە لایە خەم

ئەرێ مۆسیقا : تو ئەولایە لایەی یا دایك بو بچویکێ خو یێ ساڤا دکەت یان پێگوتنا کچەکێی لە سەر گۆڕێ کاکێ خو یێ کوشتی ؟ تو ئەو دەنگی ئەوا ژ دلۆپەکا ئاڤێ بلند دبیت یان ئەو دەنگە کو ژ سنگێ مرۆڤی هندی پیچەکا رحێ تێدا ما بیت بهێتە دەرێ ؟ تو سترانی یان لاوك و حەیرانی؟ تۆ هێزا بەستا حەسەن زیرەکی یان سۆزا خالقی ؟ تو لەگ لەگی یان قەب قەبا کەوی ؟ تو دەهۆل و زوڕنایا رۆژا نەورۆزێی یان سۆزا بلیلا دەروێش عەبدوللای ؟ تو گرنژینا زارۆکەکی یان تریقێنا پێکەنینا خێزانەکا بەختەوەری؟ تو چڤ[1]چڤا دارا چیایانی یان هۆ هۆیا جوتیارێ دەشتانی ؟ دێ بێژە من ئەرێ مۆسیقا تو چی ؟ تو چی ؟

دبێژن رۆژەکێ شڤانەکی کەرێ پەزێ خو برە چەرینێ ، ل وی دەمی لێ بو درەنگ و شەڤ ب سەردا هات ، نەچار بوو دنهالەکێدا لنك جۆك و ئاڤەکێ کو ل بندا لەڤەن لێ بوو پەزێ خو مەخەل کەت و ئەوی ژی پالڤەدا، گوهێت خو ڤەکرن ، دونیایەکا مت و بێدەنگ هاتە بەرچاڤا ، گەلەك پێڤە نەچوو بایەکێ هێن و خۆش هات و دناڤ نهالێدا بوری و ل لەڤەنا داو ئاوازەکێ سەیر ژێ بلند بوو.

---

(١) دەروێش عەبدوڵلا بلیلڤانەکێ ژیهاتی بوو ، گۆرانێ شاعیر شیعرەك پێ گوتییە دبێژیت : –
بەرەنگی زەردو شێوەی دەست و کزا ، دەروێش
حەزم کرد بەستەیەك ببەم سەراسەر حوزن و ماتەم بێ
لە سیماتا بەدیم کرد هەیکەلی عومرێکی حەسرت کێش

وەها دیارە کە بەختت ئاشیانی بولبولی خەم بێ ........

شڤانی ژ دل حەزدکر گوھ لێ بیت . ژ بەر هندێ سپێدێ رابوو لەڤەنەك بڕی و چەند کونەك لێکرن و پف کرێ ، ئەڤە ئێکەمین ئامیرێ مۆسیقایێ بوو. ئەی مۆسیقا تو دلی ڕەق نەرم دکەی ، دڕەندەی کەهی دکەی و بچویکا درەقسینی ، ماری دەمێ گول دەنگێ تە بیت سەرێ خو بلند دکەت و خو د هەژینیت ، ئەی مۆسیقا تۆ چی ؟ تو گڤ گڤا بایێ شەڤێن بارانێن بوش یێن زڤستانا چیایانی ، یان کزە بایێ هاڤینا گەرمیانی ، تو فزا فیشەکا ئازادی خوازانی ، یان ژی پێژنا کڕوکالانی ، ئەی مۆسیقا ئەڤە هەمی توی و ژڤان ژی گەلەك زێدەتری .

## دان و ستاندن :

(١) – چ دەم مۆسیقایێ کارتێکرن ل تە کریە ؟

(٢) – چ دەنگ د ژیانا تەدا وەك مۆسیقا و ئاوەزیکێ خۆش بوویە لنك تە ؟

(٣) – ئێکەمین ئامیرێ مۆسیقایێ چەوا هاتە چێکرن ؟

(٤) – بو چی مسریا نەخشێ ئامیرێ مۆسیقا خو ل سەر دیوارا هەلکولایە؟

## دێ چەوا خوینی و دێ چ خوینی

هیڤیدارین نوکە تو ب دروستی فێری هندێ بووی کو بێدەنگ بخوینی و دیسان هیڤیدارین تو فێری وی رەوشتی نەبوویە کو لێڤێت خو د خواندنێدا بلڤینی و هم همەکێ بو بکەی چنکو ب راستی رەوشتەکێ خرابە و هەر چ دیاربوون هەیە تێدا نینە ، نە هەر ئەو بەلکی دێ بیتە ئاستەنگەك د رێکا خواندنا بلەزدا و دێ تەگیرو کەت ، ئەڤجا نوکە هەر تو ب چاڤ دخوینی ، پەیڤ ب پەیڤێ ناخوینی بەلکی بڕگە ب بڕگەی دخوینی و چ ماندیبوونێ نابینی ، هەکە د بڕگەکێدا نەبیت کو باش تێناگەهی . ئەڤ ڕەنگێ خواندنێ ب راستی خواندنا خویندەڤان و تێگەهشتیانە ، چنکو هەکە وەنەکەن ژ بەر شول و کارێ وان یێ زۆر ، ب وێ راناگەهن ئەوا وان دڤێت بخوینن.

ب راستی تام و خۆشیێن خواندنێ دزۆرن ، چنکو خواندن دەرگەهێ شارەزایەکا وەسا بو مە ڤەدکەت کو بەری نوکە نەتنێ مە بیر لێ نەکریە بەلکی نەهاتیە د هزرا مە ژیدا . خواندن ئێك جۆر نینە ، هەیە چیرۆك و چیڤانۆك ، هەیە شیعرا خەملاندنی و کاریگەر ، هەیە بەحسێ بیروباوەرا دکەت ، هەیە بەحسێ دیروکێ دکەت . دیسان پەرتووك هەنە بەحسێ مللەتێن جیهانێ دکەن ، دەمێ مە خواندین ئەم تێگەهشتین کو ل جیهانێ هەر ئەم نینین . بەلکی گەلەك مللەت هەنە و هەر ئێکی وەك مە هیڤی و ئارمانجێن خۆ هەنە . جیهانا خواندن و پەرتووکان جیهانەکا بەرفرەهـ و بێ سنوورە . د خواندنێدا تە پێدڤی هاریکاریا هەڤالێن خو هەیە . بۆ هندێ دا پەرتووکێن .

باش بو ته ب هەلبژێرن بو خواندنێ ، هەڤالێن ته گەلەك پێ خوشه كو ژ ڤی لایڤه هاریكاریا ته بكەن ، دیاره ته ژی پێ خۆشه كو هاریكاریا وان بكەی. بەلێ پشتی پیچ پیچه د خواندنێدا پێش دكەڤی ئێدی هەر لنك خو دێ بینی كو تو پێدڤی كەسەكێ نینی ، دا پەرتووكان بو ته هەلبژێرن بو خواندنێ چنكو تو بخو وان نڤیسەران دنیاسی ئەوێن نڤیسینێن وان ب دلێ ته.

مرۆڤێ خویندەڤان هەمی جۆرێن پەرتووكان دخوینیت . هەتا وان ژی ئەوێن ناڤەرۆكێن وان بێ رامان و دپویچ بن ، هەكه ته گوت یا باشه ته چ مفا وەرگرت ژ خواندنا ڤێ پەرتووكێ یا ناڤەرۆكا وێ پویچ ؟ ئێكسەر دێ بەرسڤا ته دەت و دێ بێژیت من مفایێ وێ چەندێ وەرگرت ، كو ئەز تێگەهشتم یا بێ رامان و پویچه ؟ ئەوێن كو پەرتووكێن هەلبژاتی د دەنێ بو خواندنێ وەك وێ گەدا نەخۆشه ئەوا خوارنێن هەلبژاتی د دەنێ ، چنكو گەدا ساخلەم و دروست هەمی جۆرێن خوارنێ دهێریت و هەرس دكەت و تشتێن مفادار بو لەشی ژێ وەردگریت ، هەر وەسا خودانێ مەژیێ رووناك ژی هەمی جۆرێن پەرتووكان د خوینیت و هەر تشتێ مفادار بیت وەردگریت .

رۆژەكێ لاوەكێ تازه پێگەهشتی ژ ( مازن ) ی نڤیسەرێ بناڤ و دەنگێ عەرەبی پرسیار كر كو رێكێ نیشا بدەت بو هندێ دا ببیته نڤیسەرەكێ مەزن وەك وی . ( مازن ) ی د بەرسڤدانێدا گوت : ( رێكەكێ بتنێ دزانم ، ئەوژی ئەوه كو هەردەم بخوینی ) .

ئەوێن هەردەم بەردەوام نەبن دخواندنێدا . پیچ پیچە رێزو قەدرگرتنا وان لنك خەلكی كێم دبیت ، چنكو جیهان و زانست و وێژە و بیروباوەڕ هەردەم دگوهوڕین و نویبوونێدانە ، ئەوا نوكە ب راستی دزانی چەند سالێن دی وەسا دەرناكەڤیت . هەكە مل ب ملێ ڤێ گوهوڕینێ نەچی و ژ كاروانێ پێشكەفتن و نویبوونێ گیروبی ، دێ ترانا ب تەكەن و دێ بێژن مەژیێ ڤی یێ هشكە و تشتەكی وەرناگریت و مل ب ملێ پێشكەفتنێ ناچیت .

دیارە خواندنا پەرتووك و گوڤارێن نوی باشترین رێكە بو هندێ كو مل ب ملێ پێشكەفتنێ بچی و گیرو نەبی .

رەنگە تو بێژی نوكە ئەز یێ ل پۆلا هەشتێ بنەڕەتی و ب منڤە ناهێت هەر ژ نوكە پەرتووك و كۆڤارێن نوی بخوینم . بەلێ ب راستی دێ بێژینە تە هەكە تو نوكە دەست پێنەكەی و نەشێی ، هەكە مەزن بووی و ب سالڤە چووی هەر نەشێی .

ژ پەرتووكا خاندنا عەرەبی ،

پۆلا دووێ ناڤنجی

هاتییە وەرگێران

## دان و ستاندن :

١) بو چی تامەکێ ژ خواندنێ وەردگرین ؟

٢) ( مازن ) ی چ کوتە لاوێ تازە پێگەهشتی ؟

٣) بوچی ئەوێن نەخوینن ، قەدر و رێز لنك خەلکی نینە ؟

٤) چەوا دێ شێین مل ب ملێ پێشکەفتنێ و گوهورین و نویبوونێ بچین؟

٥) بوچی وەسا باشە کو ب چاڤ بخوینین و نە ب لێڤا ؟

## شكەفتا شانەدەر

كوردستان وەلاتەكێ چيايى و سەختە و چيايێن وێ ژى گەلەك كون و كەلەبەر و گەلى و شكەفت تێدايە و هەر ئێك نيشانا وێ چەندێ يە كو هەر ژ كەڤن وەرە مرۆڤ ل ڤى وەلاتى ژيايە و پەنا بو وان شكەفت و كەلەبەران بريە ، ژ وان شكەفتا ( هەزار مێرد ) نێزيكى سولەيمانيێ و شكەفتا شانەدەر يان شانيدەر ل برادۆست و گەلەكێن دى .

گوندێ شانەدەر ل دەشتەكا بەرتەنگ دايە و ( ٢٦ ) كم ژ پرا خەلانى سەر زێى خەلان كو لقەكە ژ زێى مەزن و ، ( ٤٣ ) كم ژ گوندێ خەليفان دوورە. شكەفتا بناڤ و دەنگ شانەدەر لێيە و ژ چيايێ ( برادۆست ) كو ( ٢١٠٠) پێيە ژ رويێ دەريايێ بلندە ، ژ بەر جهێ وى يێ نەخۆش هەتا نوكە رێكا ترومبێلێ لێ نينە ، بەلێ مرۆڤ ب پێيا يان ب دەوارى ب ( ٤٠ ) دەقيقا ژ بنێ چياى دگەهتە شكەفتێ كو ( ٩٠٠ ) پێيا بلندە .

دەرێ شكەفتێ بەرەف باشوورە ، ژ بەر هندێ هەتاڤ لێدەت ب تايبەتى ل زڤستانێ ، جهێ وێ و هەبوونا ئاڤێ تێدا و نێزيكيا وى ژ رويبارێ زێوە وەلێ كريە كو ژ چاخێن بەرينێن كەڤن جهێ مرۆڤێ كەڤن بيت و تێدا ژيابيت. ئەڤ شكەفتە مەزنترين شكەفتە ل ژووريا وەلاتى . شكەفتێ شێوەكێ سێ كوژى هەيە پانيا دەرێ .

وێ ( ٨٢ ) پێیە و بلندیا وێ ژی ( ٢٦ ) پێیە ، ژ ناڤدا پانیا وێ دگەهتە ( ١٧٥ ) پێیا ، ژ ناڤەراستێ ، بلندیا وێ دگەهتە ( ٤٥ ) پێیا و نێزیکی ( ١٣٠ ) پێیا کویرە ، ل ڤێ دوماهیێ و ل سالا ١٩٦٠ زاینی دیاربوو کو ل دوماهیا وی جهێ کویر دەرگەهەکێ گرتی هەیە ، بەلێ هێشتا لدور ڤێ چەندێ چ لێنێرین نەهاتینە کرن ، دەسپێکا لێنێرین و گەریان ل ڤێ شکەفتێ ل سالا ١٩٥١ زاینی بو دەمەکێ کێم ژ لایێ رێڤەبەریا گشتی یا شینوارا دەست پێکر . پشتی ڤێ ( پەیمانگەها ئەمریکی ) ب سەروکاتیا ( رالف سەلیکی ) کو هەیام هەیام دەست ب گەریان و لێنێرینێ دکر و ژ ئەنجامێ ڤەکولینێ لسەر ئاخا شکەفتێ ، بو وان دیار بوو کو گەلەك ژ کەڤن وەرە مرۆڤ دڤێ شکەفتێدا ژیایە ، چنکو ئەو بەر و کەل و پەل و هەستی و پاشمایێن مرۆڤان ئەوێن ل وێرێ هاتینە دیتن و لدیف تەخا ئاخێ کو کرنە چوار پشك ، دیاربوو کو ئەو پاشمایێن د پشکا ئێکێدا هاتینە دیتن بو ( ٧٠٠٠ ) سالا بەری نوکە ڤەدگەرێن و ل پشکا دوویێدا بو( ١٢٠٠٠ ) سالان و ل ژێر تەخا دوویێدا ( ١٧٠٠٠ ) سالان کو د وێرێدا مرۆڤ نە ژیایە و ژ ( ٢٩٠٠٠ ) سالا هەتا ( ٣٤٠٠٠ ) سالا کو تەخا سێیێ یە ، خولی و کەل و پەلێ بەرین وەك یێت دەورێ بەرینێ گەلەك کەڤن وەسایە کو دبێژنی (ئۆرکینشی) و تەخا چوارێ بو ( ٤٥٠٠٠ هەتا ٧٠٠٠٠ ) سالێ پەیکەرێ هەستیێ مرۆڤی کو ب مرۆڤێ ( نیاندرتالێ ) بناڤ و دەنگ هاتە دیتن دگەل پەیکەرێ هەستیێ زارۆکەکێ کو یێ نیاندرتالێ، ئەڤ جۆرێ مرۆڤی گەلەك جودایە ژ مرۆڤێ چاخێن نێزیك و وێنەیێ

کەڤنترین مرۆڤە کو ل عیراقێ هەتا نوکە هاتیە دیتن . ژ بلی ڤی گەلەك گژ و گیا و رووەك و گولێن وان سەردەما تێدا هاتە دیتن ، کو پتریا وان هەتا نوکە ل چیایێن زاگروس ل کوردستانێ هەنە و شین دبن . ئەڤجا دڤێت بزانین کو شکەفتا شانەدەر جهێ پاراستنا پاشمایێ یە و پەیکەرێ کەڤنترین مرۆڤە ، ئەڤەژی وێ دیار دکەت کو هەر ژ کەڤن وەرە وەلاتێ کوردستانێ ژیان و مرۆڤ تێدا بووینە و پەنا بو چیا و شکەفتان بریە ، ئەڤجا تو ژی ب رێزگرتنڤە تەماشە بکە .

**دان وستاندن :**

١) بوچی مرۆڤێ کەڤن چوو د شکەفتانڤە ؟

٢) شکەفتا شانەدەر دکەفتە کیری ؟

٣) ئەو تشتێن ل شانەدەر هاتینە دیتن چنە ؟ چ دیار دکەن ؟

٤) مرۆڤێ ( نیاندرتالْ ) چ جۆرێ مرۆڤی بوو ؟ ل کیرێ هاتیە دیتن ؟

٥) ناڤێ چەند شکەفتا بێژە کو ل کوردستانێ هەنە ؟

# ئەدیسۆن

## ١٩٣١ - ١٨٤٧

ئەڤ ناڤدارە ل سالا ١٨٤٧ - ١٩٣١ ل وەلاتێ ئەمریکا ل باژێرێ ( میلان ئۆهایۆ ) هاتیە دونیایێ و دایك و بابێن وی د هەژاربوون ، ئەو ژی مرۆڤەکێ لاواز و بێ خێر بوو ، د خواندنێدا گەلەك یێ لاواز و مەژی هشك بوو ، رۆژەکێ مامۆستایێ وی گوتێ (( نزانم دایك و بابێن تە چ ژ تە دبینن و تو دانایە بەر خواندنێ و تشتەکی ژی فێرنابی )) . ئەدیسۆن گەلەك ب وێ ئاخڤتنێ هەرشی و د چیتە مال و وێ ئاخڤتنێ بو دایکا خو دبێژیت ، دایکا وی ژی ل دلە دلێ وی د دەت و پشت راست دکەت و دەستێ خو د دانیتە سەر ملێ کورێ خو ، لبەر سیبەرا دایکا خۆ ناڤێ ئەدیسونی ل هەمی جیهانێ دەنگڤەدا . ژ بەر ڤێ چەندێ هەردەم دگوت ( دایکا من ئەز پێگەهاندم ) . د ژیێ یازدە سالیێدا دەست هاڤێتە کیمیا گەریێ . د وی سەردەمیدا دەست کورتی تەنگاڤ کربوو . گوتە دایك و بابێ خو کو رێ بدەنێ دا کار بکەت . ئەوان ژی رێ دایێ . ئەڤجا دەست پێکر و رۆژنامە و فێقی فرۆشتن . لڤێرێ پیچەکێ ڤەژیا و ژ دەستێ هەژاریێ پیچەکێ رزگار بوو .

جارەکێ کورەکێ خزمەتکارێ شەمەندەفەرێ ئەوبوو دا کەفتە بن شەمەندەفەرێ. بەلێ ئەدیسۆنی رزگار کر ، بابێ وی کورێ بو خەلاتێ ڤی کارێ ، ئەدیسون فێری تەلگرافێ کر .

ئەدیسۆن د ژوورەکا شەمەندەفەریدا مژویلی کیمیا گەریێ دبیت . شیشەکا فسفوری دکەڤیت و ئەو ژوور د سوژیت . چاڤدێرێ شەمەندەفەرێ زللەهکێ ل بن گوهێ وی د دەت . ژ بەر وێ چەند ئەدیسۆن هندی مای هەر یێ کەڕ بوو .

د شازدە سالییێدا ل تەلگرافخانا ( ستراترفۆرد ) هاتە دامەزراندن ب هەیڤانەکا کێم ژ ڤێرێ پێڤە ب رۆژێ خو ب کیمیا گەریێ مژویل دکر و ب شەڤێ کارێ تەلگرافێ دکر . بەلێ دکارێ تەلگرافخانێدا هەر چەندە گەلەك خزمەتەکا ژ هەژی نیشادا . دگەل هندێ نەهێلانە لسەر کارێ وی و دەرئێخستن . د ژیێ بیست و ئێك سالیێدا داهێنانەکا دی پەیداکر . د بیست و دوو سالیێدا ل باژێرێ ( نیویۆرك ) دەست کورتیێ ب دروستی شەپرزەکر ، ب نەچاری چوو نك ( میستەرلو ) بو پەیداکرنا پاریێ نانی ، ئەڤ میستەرلوە سەرۆکێ وێ هەڤپشکیێ بوو ، ئەوا دەنگ و باسێن بهایی بسەر بازرگان و مەزناندا بەلاڤەدکر ، هەڤپیشکیێ د پاداشتا وێ چاکییێدا، هەیڤانە شیست لێرە بو تەرخانکرن ، ئێدی ژ وێرێ پێڤە ، ئەدیسۆن ژ بەر وێ چەندێ کو کاروبارێ وی باشتر لێ هاتن ، ئەڤجا کەڤتە ژێر ئەرکێ داهێنانێ . داهێنانێن ئەدیسۆنی زۆر زۆرن . بەلێ ژ هەمیان مفاداتر ( چرایێ ئەلەکتریك، بزوێنەرێ ئەلەکتریك ، سینەما و گرامافۆن ) ن ، ئەڤ زەلامێ پایە بەرز د ( ٨٤ ) سالێن ژیانا خودا گەلەك خزمەتێن بەرز پێشکێشی مرۆڤایەتیێ کرینە . ژیانا مرۆڤێ سەردەمێ خۆ و پشتی خۆ ب ئەگەرێ داهێنانێن وی ژ تاریێ.

گەهاندە رووناهیێ . ب ئەگەرێ رەوشتێ وی یێ جوان و داهێنانێن وی یێن جوان بو ئێك ژ مەزنە زەلامێن سەردەمێ خوّ و پشتی خو . چەند خوّش بوو بو جیهانێ ئەو سەردەمێ ژیێ ئەدیسوّنی هەشتێ سالْ . سێ سەد کەس ژ زانا و داهێنەرێن ئەورووپا و ئەمریکا ل مالا وی کوّم دبن بو ئاهەنگا جەژنا ژ دایك بوونا وی ، بەلێ هەر ل وی دەمی وەك زاروّکەکێ ساڤا دەست ب کەنیێ کر و مێڤان بجه هێلان و قەستا کارگەها خو کر . دلێ وی گەلەك ب وێ سوّپاس نامێ خوّش بوو ئەوا ( توّلستوّی ) بوّ هنارتی ، دەمێ گرامافوّن داهێنای و دانەیەك وەك دیاری بوّ توّلستوّی هنارت ، سەیرتر ئەو بوو ئەدیسوّن دگەل ڤێ هەمی زیرەکیێ و ئازایەتییێدا پارە و تشتێ دی لنك وی چ نەبوو............

د ژیار و بوراندنێدا یێ سست و خاڤ و خەمسار بوو . دگەل هندێ و کو کارگەه و خانیێ وی برەخ ئێکڤە بوون ، بەلێ گەلەك جارا چەند روّژ و چەند شەڤا نەد چوو مال ؟ دەمێ مال ئاڤایی کری . ل سەرانسەری وەلاتێ ئەمریکا بو چەندەکێ هەمی چرایێن ئەلەکتریکێ هاتنە ڤەمراندن . ئەڤەژی ژ بەر نەمریا ئەدیسوّنی بوو ، ب ئەگەرێ داهێنانێن خو چرایێ ناڤێ خوّ روونکر .

## دان و ستاندن :

١) تو چ ژ ژیانا ( ئەدیسوّن ) ی فێر بووی ؟

٢) ناڤێ چەند داهێنان و داهێنەرێن دی بنڤیسە ؟

٣) تو چ ژ چیروّکا ئەدیسوّنی فێربووی و تە چ بو خو ژێ وەرگرت ؟

٤) پەیداکرنا هێزا ئەلەکتریکێ ( کارەبا ) چ داهێنانا دی ل دویڤدا هات؟

## ئێكێ ئەیارێ

سترانەكا كوردی هەیە دەبێژیت ( بهار مانگی نیسانە ) هەر ئەو سترانا كوردی ل بهار و نیسانێ بەحسێ مێرگ و گول و گولزاران دكەت . بەحسێ خۆشیێ و گول و سەیرانا دهێتە كرن ، ل رۆژێن دوماهیا نیسانێ هەمی باژێرێن ل سەر ڤی عەردی خۆ بۆ رۆژا ئێكێ ئەیارێ بەرهەڤ دكەن .

نهۆ ئێكێ ئەیارێ ل سەرانسەرێ جیهانێ جەژنە ، شاهیە ، خۆشییە ، كەرنەڤالەكا هەمەرەنگە ، جەژنا كرێكارێن جیهانێیە ، جەژنا هەمی كەس و دەستە و تەخێن گۆمەلێیەیێن باوەری ب تەخەیا كرێكاران هەی . وێ تەخەیا ب شیان و زەند و باسك هلدای ب رابەرێ گەلان دزانن ، كاروانێ خەبات و ژیانێ و بنیات دانانا دوا رۆژا پڕ شادی و بەختیاری و پێشكەفتن و شارستانییەتێ .

**لێ چەوا ئێكێ ئەیارێ بوویە جەژنا كرێكارێن جیهانێ ؟**

دەمێ دهێیە سەر ڤی بەحسی دڤێت چیرۆكەكا دیرۆكی یا پڕ خوینا تەخەیا كرێكاران ڤەگێرین ؟ چیرۆكا ڤێ كارەساتێ بوو شادی ، ئەو شینی و بەهی بوونە جەژن ، ئەو زولم و زۆرداری و خوین رشتن تیرۆژكەكا نویا ئازادیێ و سەركەفتنێ و خەباتێ ژێ هات .

ل سالا ( ١٨٨٦ ) ێ ز ل باژێرێ ( شیكاغۆ ) ل ئەمریكا كرێكارێن كارگەها ( میكرنیك ) بڕیارا مانگرتنێ و كارنەكرنێ دا ، و ب ڤێ رێكێ داخوازا پشكەكێ ژ مافێ خۆ یێ دەست ب سەرداگرتی بكەن . داخوازا زێدەكرنا كرێ و باشكرنا ژیانێ و جهێ كاركرنێ دكر .

سەرمایەدارێن خوینمێژ و کەد خوَر ئەڤە ب دلی نەبوو ، وان نە دڤیا دانپێنانێ ب مافێن کرێکاران بکەن ، دەستێ خوَ ژوێ پشکا قازانجی هەلگرن ، کو هەمی بەرێ کەدا کرێکارانە و هەقێ کرێکارانە و ئەو وی هەقی دخوَن .

دەمی کو سەرمایەدار ب گورز و گوللە و ئاسن و بەندیخانەیێ نەشێت خەباتا کرێکاران راوەستینیت ، دێ پەنایێ بەتە بەر فندوفێلا ، هەر ب ڤی رەنگێ نە زەلامینیێ دگەل کرێکارێن شیگاغوَ لڤین ، ب فێل گازی وان کر بوَدان و ستاندنێ ، هەر د وی جهێ کو کرێکار تێدا کوَمبووین ، کرێگرتییەکێ خوَ ئینا بوو ، جلکێن کرێکاران کر بوونە بەر ، وی کرێگرتی دەمانجەیەك دانا پوَلیسەکی کو ل وی جهی راوەستابوو ، ب ڤێ بەهانە بوَ پوَلیسان چێبوو ، بوَ هندێ کو تەقەیێ ل کرێکاران بکەن و گەلەکان ژێ بکوژن و پشتی کوشتنێ گەلەك گرتن و ناڤێ خەباتا کرێکاران ژی پیسکر .

بەلێ گەلەك ڤەنەکێشا راستی دەرکەفت و زانی کو ئەڤە فندوفێلێن سەرمایەدارانن و ئاشکرا بوون .

دادگەها پر دادیبا مروَڤاتییێ سەرمایەدار گونەهبار کرن و کرێکارێن شیکاغوَ بێگونەه دانان . هەر ل وی دەمی کونگرەیەکێ کرێکاران داخوازکر کو هەمی کرێکارێن جیهانێ روَژا ئێکی ئەیارێ ب روَژا خوَ بزانن ، روَژا خەباتا کرێکاران ، روَژا دەرکەفتنا هەقێ کرێکاران و پاقژی و سەر راستییا تەخەیا کرێکاران ، وێ روَژا ب خوینا پاقژا وان یا ب نەحەقی .

رشتی راستییەك ژ راستیێن ڤی سەردەمی تێدا دەركەفت ، راستییا ماف و دەست دانە هێلان و رابەرییا تەخەیا كرێكاران . پشتی كرێكارێن ئەمریكا، گەلەك وەلاتان ، ئەڤ رۆژە ب چەژنا خۆ دانا و ئەڤ رۆژە كرە نیشانە بۆ بیرئینانا شەهیدێن شیگاغۆ و هەمی خەباتكەرێن وێ تەخەیا رابەر ، بۆ نیشانەیا تێكۆشانا كرێكاران و بۆ جەژنا سەركەفتنا پالا و زەحمەت كێشان .

رۆژ ل دویڤ رۆژێ ، سال ل دویڤ سالێ ل گەل سەركەفتنێن نوی یێن تەخەیا كرێكاران ، وەلاتێن تازە ئەڤ رۆژە ب جەژن نیاسی و كرە رۆژەكا بێهنڤەدانێ ، ل وەلاتێ مەژی دەمەكە كرێكار ئێكی ئەیارێ ب رۆژ و جەژنا خۆ دزانن ، دەمێ وەلات ل ژێر حوكمێ رژێما كەڤنە پەرستا پاشایەتی ، كرێكاران ب دزیڤە ئاهەنگا جەژنا خۆ دكر ، لێ شۆرەشا چواردەی گەلاڤێژێ سالا ١٩٥٨ ز ئەو رژێم سەر و بن كر ، ئێكێ ئەیارێ ب جەژن هاتە دانان و رۆژا بێهنڤەدانێ ، ل ئێكێ ئەیارێ كرێكارێن عیراقێ ژی ئاهەنگێ دگێرن، جەژنێ دكەن ، نیشانەیا ئێكگرتنا ریز و خەباتا خۆ دەردئێخن ، بیرهاتنا شەهیدێن كاروانێ كاركەران گەهشتە ئاخا مەژی ، یا وەكو هۆزانڤانەكێ كورد دبێژیت :

**هەر چەندە ورگنەكان**

**بەری تەقەلا چنەكان**

**به فێڵ و فڕ**

**کوژا نیانەوە گڵپەی ئاگر**

**بەڵام ڕۆژی ئایاری سوور**

**شەماڵ ناوی فڕان بۆ دوور**

**بوو بەچرا**

**ئایار بووبە پشت و برا**

ڤێجا دڤێت ئەم ژی ل ڕۆژا ئێکێ ئەیارێ ل گەل تەخەیا کرێکارێن وەلاتێ خۆ جەژنێ بکەین و ئالایێ خەباتا سەرکەفتنێ بلند بکەین و سروودا وێ تەخەیا رابەر بخوینین و هەر ل گەل هەمی هۆزانڤانێن شۆرەشگێر و وی هۆزانڤانی بێژین :

**بۆیە ئەیار**

**نەک هەر دەرگای جەور شکێنە**

**وەک ڕۆژی شەوگاری تار**

**دوایی بەزۆ داران هێنە**

**ساتۆ ئەی ئایاری ڕەنگین**

**جەژنی گشت ئازادی خواهانی**

**بۆ پێشخستنی گیان و ژین**

**لە ڕێبازا چرا مانی**

**دڵنیابە تۆی خوێناوی**

**تا کرێکارێ مابێ ، ماوی**

## ڕاڤەكرنا پەیڤان

| | |
|---|---|
| خۆ بەرهەڤ دكەن | : خۆ ئامادە دكەن ، خۆ حازر دكەن . |
| نهۆ | : نۆكە ، ڤێگاڤكێ ، ئێستا . |
| كەڕنەڤال | : میهرەجان . |
| تەخە | : چین . |
| فندوفێل | : حیلە ، فێلبازی . |
| بەهانە | : بیانوو ، هێجەت . |
| ورگن | : زك مەزن ، زك هیز . |
| تەقلا | : خەبتین ، هەوڵ . |
| كوژاندیا نەوە | : ڤەمراندن ، تەمراندن . |
| گڵپە | : گوڕی . |
| جەور | : زۆرداری ، ستەم . |
| تار | : تاری . |
| ئازادی خواهان | : ئەوێن حەز ژ ئازادیێ دكەن . |
| خوێناوی | : ب خوین . |

**دان و ستاندن :**

١ – ل ئێكێ ئەیارێ هەست ب چ دكەى ؟

٢– ئەرێ تۆ دزانی ئەو دێرێن هۆزانێ یێن كێنە ؟ و د كیژ دیوانێدا بەلاڤەكرینە ؟ بیرا خۆ لێ بینە ، ئەگەر تە زانی تەماشەى ڤان چەند دێران بكە و ل دویڤ دیوانێ بگەریێ :

(( ئەڤە هندەك دێرن ژ هۆزانا ( ئێكێ ئەیارێ ) هۆزانڤانەك پتر ب ناڤێ ( ع – ح – ب ) هۆزانا د رۆژنامە و كۆڤاراندا بەلاڤە كرینە ، ئەو بخو ناڤێ وى ( محەمەد شێخ حوسەین بەرزنجی ) یە سالا ١٩٢٣ ز ل ( بەرزنجە ) ژ دایك بوویە ، سالا ١٩٣١ ز هاتییە سولەیمانێی و تا نهۆ ل وێرێ دژیت ، دیوانا وى یا چاپكرى ناڤێ وێ ( ناسوورەى دەروون ) ە .

٣ – ئەرێ هۆزانا هۆزانڤانەكێ دى ل سەر ئێكێ ئەیارێ د زانی ؟

٤ – دەھ رێزان ل سەر ڤێ بنڤیسە : ( تەخەیا كرێكاران پێشەنگێ پێشكەفتن و سەر كەفتنا هیڤیا مرۆڤایەتییێیە ) .

# هەلەبجەیا شەهید

هەلەبجە باژێرەکێ جوانێ کوردستانێیە ، دکەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ باژێرێ سولەیمانیێ ، د ناڤ هەمبێزا زنجیرا چیایێن سەر بلندێن هەورامان و شنرۆی و بالا جودا ، ب دیمەنێن سرۆشتێ رەنگین ، ئاڤێن سازگار ، زەڤیێن ب پیت و بەرەکەت ، زۆریا بەرهەم و فێقی ، دارستانێن پڕ دار ، هوینکاتیا بای، کانگایێن ئاسنی و گۆکردی و گێجێ ب ناڤو دەنگە ، هەلەبجە باژێرەکێ گەلەکێ کەڤنە دیرۆکا وێ گرێدایە ب دیرۆکا شارەزوورێ میرگەها بابان، ل سەردەمێ ئوسمانییان بنگەهـ و بارەگایێ لەشکەرێ ئەوان بوو ، ل دەڤەرا هەلەبجە گەلەك گرێن شوینوار و وێنە و نیگارێن جۆرا و جۆر دهێنە دیتن ، کو مێژوویا وان بۆ سەردەمێ ئاشۆریان و میدییان ڤەدگەریێت .

هەر ژ کەڤندا هەلەبجە و دەڤەرێن دەورو بەرێ وێ مەلبەندێ خواندن و زانستێ بوویە ، جهێ مامۆستا و زانایێن پایە بەرزێن ئایینی بوویە ، د بوارێ ئەدەبیاتادا شارێ هەلەبجە وەکی ستێرەکا گەشا بریقەدار ل ئاسمانێ کوردستانێ گەش بوویە ، گەلەك ژ هۆزانڤانێن ناڤدارێن کورد ل ڤێ دەڤەرێ پەروەردە بووینە و پێ گەهشتینە وەکی ( مەولەوی ، وەلی دێوانە ، تاهیر بەگ جاف ، گۆران ، ئەحمەد موختار جاف ، کاردۆخی ...... ) .

هەلەبجەیا شەهید هەمی گاڤا بنگەهێ شۆرەش و راپەڕینا بوویە ، بۆ شۆرە سیار و شۆرەشگێڕان جهێ ڤەحەواندنێ بوویە ، سترێێ چاڤێن ناحەزان بوویە، ژ بەر هندێ هەر ژ کەڤندا دوژمن و داگیرکەرێن کوردستانێ کەرب و کینەیا خۆ .

بەرانبەر وێ دەڤەرێ دیارکرییە و هێرشێن دڕندانە برینە سەر . ئینگلیزان ل سالێن پشتی جەنگا ئێکێ یا جیهانی ل سەردەمێ شۆرەشا شێخ مەحموودێ نەمر ب چەند فرۆکەیەکا شارێ هەلەبجە و عەبابەیلی بوردمان کر و گەلەك خەلکێ بێ گونەهـ شەهیدکرن ، هەر وەسا شارێ هەڵەبجە ل رۆژا ١٩٧٤/٤/٢٦ ز کەفتە بەر هێرشا عەسمانییا فرۆکێن بەعسیا هەڤ دەم ل گەل بوردمان کرنا باژێڕێ قەلادزێ یا خویناوی ، خەلکەکێ زۆر شەهید و بریندار بوون .

ل بهارا سالا ( ١٩٨٨ ) ز کو شەڕێ عیراق و ئیرانێ هەبوو ، ئیرانییان لەشکرێ عیراقێ شکاند و دەڤەرێن هەڵەبجە و خۆرماڵ و بیارە داگیرکرن ، وێ روودانێ رێ ڤەکر بۆ دەستهەلاتدارێن رژێما بەعس تۆلا لەشکرێ خۆ یێ شکەستی ژ خەلکێ بێ دەستهەلات ڤەکەت ، کەرب و کینەیا دلێ خۆ یێ رەش رشتە سەر کوردان ، ئەو بوو ل ( ١٩٨٨/٣/١٦ ) ز ب هۆڤانەترین شێوە ب چەکێ کیماوی هێرش کرە سەر باژێڕێ هەڵەبجە و دەوروبەرێن وێ دا ، ب هزاران بچووك و ژن و زەلام و کەنج و نوی پێگەهشتی ل کولان و شەقامێن باژێرێ هەڵەبجە د مەزنترین روودانێن دیرۆکێدا شەهیدکرن و ب هەزاران دەربەدەرکرن . ئەڤ کارێ بێ وژدانێ رژێمێ دڤی سەر دەمیدا یێ بێ وێنەیە و گەلەك هۆڤانە تربوو ل کریارێن نازییان .

ئەڤ کارەساتەیا دلتەزین د دەمەکیدا روودا کو سەرێ بهارێ بوو . دەشت و دۆڵ و چیا جلکێن کەسك کر بوونە بەرخۆ ، پشکوژێن .

دار و باری پشکفتبوون ، گول و بەیبین و بنەفشۆك و چنوور دەست د ستویێ ئێك وەراندبوو و ئەو دەڤەر خەملاندبوو .
ئاکنجیێن دەڤەرێ چاڤەرێیێ گەشت و سەیرانێ بوون .
خۆ بەرهەڤکربوو بۆ جەژنا نەڤرۆزێ ، بەلێ مخابن ل شوینا بێهنا گولێن جوان و ئاهەنگ و خۆشیێ عەورێ نەگبەتێ عەسمانێ هەلەبجەیا شرین گرت و خەردەل باراند ، ب هزاران مرۆڤ و تەیر و مەڕ و مالات قڕکرن و بوونە قووربانێن زولم و زۆرداریێیا بەعسا خوینڕێژ .
کیمیا بارانا هەلەبجەیا رەنگێن کارەساتەکا ترسناکا تراژیدی بوو ، دڤیا وژدانا سەرانسەرێ جیهانێ بۆ هەژیابا ، چاڤێن هەمی مرۆڤان روندکێن ب خوین بۆ رشتبا ، بەلێ مخابن حوکمەتێن دنیایێ حەتا مللەت ژی بەرامبەر ڤێ کارەساتێ بێ دەنگ بوون . ژ بەر بەرژەوەندییا خۆ . د دەمێ خۆدا ب تانا گەلێ مە یێ زولم لێکری نەهاتن ، گوهێ خۆ ل هەوار و نالێنالێ قەومییا نەگرت .
هاریکارییا بریندار و دەربەدەرا نەدا ، پشتەڤانی ل مافێ مرۆڤی نەکر ، دەنگێ خۆ بەرامبەر گونەهباران بلند نەکر و رسوانەکرن ، هەر چەندە هندەك بێزارییا دەربڕینێ هەبوو ب شێوەکێ تاك و تەرا و بەلاڤ بەلێ د ئاستێ پێدڤیدا نەبوون .
هەلەبجەیا شرین تو بوویە هەڤالا هیرۆشیما و ناکازاکی ، توبێژی ئەو زۆرداریا لێ هاتییەکرن هەروەسا ب ساناهی بهێتە ژبیرکرن ؟ نەخێر چوجارا چاڤەڕێی ئەڤێ نەبە ، برینەکا کوورە زویکا ساخ نابیت ، هندی .

کورد مابن ژ بیر ناکەن ، نەوە ل دویڤ نەوەی دێ ئێك و دوو تێگەهینن کو کورد ب هەناسە کێشانێ شەهید بووینە .

ئەڤ کارەساتا مەزن و کاڤلکرنا گوند و باژێرکا ، زەبر و زەنگا بێ سنوور یا رژێمێ و ئەنفال و هەمی جۆرێن ئەشکەنجەدانێ ، گوڕیا ئاگرێ شۆرەشا کوردی خۆشتر کر ، خۆڕاگرتن و شیانێن خەلکی ب هێزتر بوو ، گولا هیڤییا گەشتر بوو ، ریزا هێزێن نیشتمان پەروەر موکمتر بوو ، هێزا گەل هاتە مەیدانێ و وەکی ڤۆلکانەکێ پەقی ل راپەرینا ئادارێ ل ١٩٩١/٣/٥ خۆ دیار کر ، دام و دەزگەهێن سەرکوتکەر و تیروورستێن رژێما بەعس رامالین و ژ ناڤبرن و کوردستان رزگار بوو ، پەرلەمان و حکومەتا کوردستانێ پەیدابوون و پشتی وێ سەرکەفتنا مەزن ، ب هێزا زەند و باسکێن گەلێ مە ، ب دەستێ هاریکاریێ باژێڕێ هەلەبجەیا شەهید هاتە ئاڤەدانکرن ، دەربەدەر و لێ قەومی ب جهێ ئاکنجیبوونا باب و باپیرێت خۆ دلشاد بوون ، نهۆ ژی هەمی کورد هەر سالێ ل بیرهاتنا وێ کارەساتێ کو شازدەی ئادارێیە سەرێ ریزگرتنێ بۆ گیانێ پاقژێ شەهیدێن هەلەبجە د چەمینن و قەفتە گولان ل سەر گۆڕێن وان دادنن و سۆز و پەیمانا نوی دکەنەڤە کو بەردەوام بن ل سەر خەبات و تێکۆشانێدا بۆ پارستنا دەستکەفتان و ب دەستڤەئینانا هەمی مافێن رەوا یێن گەلێ مە ، بزاڤێ دکەن رەه و ریشالێن هەڤرکیێ و تۆڤێ دوو بەرەکیێ هەلبکێشن ، ب ئێك دل و ب ئێك مەبەست ژ پێخەمەتی دوا رۆژا نەتەوەیا کورد و چارەنڤیسا وێ خەباتێ دکەن و تێدکۆشن .

## ڕاڤەکرنا پەیڤان

گۆکرد : کبریت .

دیرۆك : مێژو .

پایە : پلە .

دڕندانە : هۆڤانە .

ئاکنجی : خۆ جه .

ترسناك : ب ترس .

تان : تەوار .

ڤۆلکان : بورکان .

## شۆرەشا مەزنا ئەیلوولێ ١٩٦١

گەلێ کورد خودانێ نیشنمانەکا بەر فرەهـ و ب پیت و بەرەکەتە ، هزاران ساڵە گەلێ کورد ل سەرڤێ ئاخێ کو جهێ باب و باپیرێن وانە ئاکنجینیە ، دوژمنان هەمی دەما چاڤ ل سامانێ وێ بوویە ، ژ بەر هندێ هۆڤانە و نەمرۆڤانە هێرش و پەلامار هێنانە سەر و ب هێزا چەکی داگیر کرییە ، ئیمپریالیزما نوی ژی چنکی پشتەڤانیێ ل زوڵم و زۆردارییێ دکەت ، لەوا پشتی شەرێ مەزنێ ئێکێ بوو پاڵپشت بۆ دەولەتێن داگیرکەرێن کوردستانێ و نیشتمانا کوردی و کوردستان دابەشکر . کوردستان بوو چوار پارچە و هەر پارچەیەك دا دەولەتەکێ ، ئەو ستەما ل گەلێ کورد هاتییەکرن خاڵەکا رەش بوو ل ناڤ چاڤێن مرۆڤایەتییێ ، ئەو خاڵ ژی رانابیت و ژێ ناچیت حەتا ئەو گەلا زوڵم لێکری ب هەمی مافێن رەوایێن خۆ نەگەهیت .

بەشەکێ گەلێ کورد ڤبەر عیراقێ کەفت ، ئەو بەش دەهان ساڵا پتر کەفتە بزاڤ و تێکوشانێ و خەباتەکا دژوار گرتە بەر بۆ ب دەستڤە ئینانا کێمترین مافێن خۆ یێن رەوا ، بەلێ مخابن حوکمەتێن عیراقێ گوهـ نەددا داخواز و حەزێن کوردێ عیراقێ و هەمی جاران ئاگر و ئاسن بۆ کپ کرنا گەشبوونا شۆرەشێ بکار دهات .

شۆرەشا ١٤ی گەلاڤێژا ١٩٥٨ ز ل عیراقێ و سەرەو ژێرکرنا رژێما پاشایەتییێ گوهڕی و تێنا وێ بزاڤا رزگاریخوازا گەلێ مە ل بەر دەم کوردێ عیراقێ روهنکر ، کوردێ عیراقێ ماوەیەکی .

بێهنا ئازادیێ و تەناهیێ هەلکێشا ، بەلێ ل سەر رێ داچوونا شۆرەشێ هەمی هیڤیێن گەلێ کورد تێبرن ، دەستهەلاتدارێن شۆرەشا تیرمەهێ ژ هەمی پەیمانێن خۆ لیڤەبوو ، و کەتە گیانی کورێن مللەتێ کورد ، ب نەچاری کوردان دەست دا چەکێ بەرەڤانیکرنێ و پشت قایمکرن ب چیایێن سەر بلند و ب بیرو باوەرێن نەلڤێن، کوردایەتیێ شۆرەشا یازدەی ئەیلوولێ سالا (١٩٦١) ێ هەلکر ، نەژ بەر هندێ کو کورد حەز ژ کوشتنێ دکەن ، بەلکی نەچار بوون ڤێ رێکی بگرنە بەر بۆ بەرەڤانیکرنێ ژ مان و مافێن خۆ . هندی پاشتر بوو ئاگرێ شۆرەشێ ب گوڕی تر د بوو دەهان هەزار پێشمەرگێن ب جەرگ و زەند و باسك پیلا ل چیا و کەژ و شاخێن کوردستانێ بەلاڤبوون ، گورمێنا تۆپان و گڕە گڕا فرۆکان و ڤیز ڤیزا گوللەیان ببوونە سیمفونیا یا سەردەمی، ئەو رۆژگار بوو شەڤ و تەم و مژا رەش شاپەڕێ خۆ ب سەر کوردستانێدا کێشا ، ب دەهان داستانێن ئازایەتیێ و قارەمانیێ هاتنە تۆمارکرن ، حکومەتا عیراقێ چەند جارەکا ب نەچاری شەڕ راوەستاند و راگرت و داخوازا دانوستاندنان دکر ، هەمی جارا ژی گەلێ کورد و سەرکردایەتییا خۆ ل دویڤ داخوازییا وان دهاتن چونکی مللەتێ کورد شەڕخواز نینە ، بەلکی ئاشتیخواز و مرۆڤ دۆستە .

ل جارا دوماهیێ دانوستاندن درێژبوو ، گفتوکۆ بەردەوامبوون حەتا ل دوماهیێ بەیانا یازدەی ئاداری سالا ( ١٩٧٠ ) ێ دەرچوو کو تێدا بۆ جارا ئێکێ حکومەتێ دان ب مافێ خوریێبەرییا کوردان دا ، ئاگرێ شۆرەشێ حەتا دەمەکی بێدەنگ بوو ، گورمێنا توپا و گڕە گڕا فرۆکان نەمان و ل جهێ وان ساز و دەنگێ دهۆل و زوڕنا کوردەواریێ ل دۆل و نهالاندا دەنگ ڤەددا ، لویلیا تڤەنگ و .

تۆپان حەلاندن و کرنە گێسن و مەربێل بۆ زەڤی کێلانێ و ئاڤەدانکرنێ . بەلێ ئەو بارودۆخ گەلەك ڤەنەکێشا ، حکومەتا عیراقێ ل هەمی پەیمان و بڕیارێن خۆ پەشێمان و لێڤەبوو ، پشتا خۆ دا کوردان و بەرێ خۆدا کۆمەڵەکا هەلبەرست و مرۆڤێن نە ژ هەژی ، ژ بەر وێ چەندێ شۆڕەشا کوردی دووبارە ژ هەمی لایەکی ڤە گوڕیا وێ هەلبوو .

## ڕاڤەکرنا پەیڤان

پیت : بەرەکەت .

ئاکنجی : خۆ جە .

پالپشت : پشتەڤان .

کپ کرن : بێدەنگ کرن .

تێن : تێهن ، گەرماتی .

## خێزانەکا ئاوارە ( دەربەدەر )

وێ ساڵێ داهاتێکی باش بوو ، وەرزان هەر ئێکی ب ئارەزوویا خۆ تێلا ئارمانجا خۆ بۆ مەبەستەکێ لێ ددا ، کو چەند ساڵەك بوو چاڤەریێ داهاتێکی وەسا بوون ، ژ بلی وان کەسان نەبیت کو ب تەمامی بارێ ئاڵۆزێ وەڵاتێ خۆ دزانی و دوژمنێن گەلێ خۆ باش نیاسیبوون کو ب فەرمانا بیانیان کاردکەن دژی بەرژەوەندیا ڤێ کۆمەڵا تێکوشەر ، لەورا سویند خوار ب پیروزترین تشت ل نك وان کو حەتا دوا هەناسە و دوماهیك دلۆپا خوینێ ب هەمی هێزو شیانێن خۆ دژی داگیرکەران شەری بکەن و خۆ نەدەنە دەست دوژمنی داکو ترانە و گەمان ب پرۆژەیێ ( زندە بەچاڵان ) بکەن .

چەرخێ گەردوونی زڤری ب سەر چارەنڤیسێ مللەتیدا ، دوژمن ب هاریکاریا ناپاکان هێرشەکا نارەوا هێنایە سەر دەڤەرێ جوتیار و زەحمەتکێشان بەرسنگێ لەشکرێ ستەمکاران گرت ، ئەوێ سەد ساڵا ئێك و دوو نەڤیای ، دڤی شەرێ هەتکبەروناحەقدا یەکتر گرت بۆ پاراستنا نیشتمان و دەڤەرا خۆ ، ئاگر ل دوژمنان باراند ، وەکی شێران گازی دکر :

بژی ئازادی ، بژی کوردستان .

دۆست و برادەرێن گیان ب گیان ، ئەڤی دگۆتە ئەوێ دی ، ها..............

قوربان ، قوربانی کوران بم ، مرن یان سەرکەفتن و زاڵبوون ب سەر دوژمنێ روورەشدا .

بابێ پشت کودێ ب ناڤ ساڵڤەچوویێ گۆپال ب دەست دگۆتە کورێ خۆیێ ئێکانە : کورێ من ، مەردانە شەری بکە ، دوژمنی ببەزینە ،(( بەرخێ نێر بۆ

سەر بەڕینە )) بلا دایك و خوشكێن هەوە ب دیلی نەكەڤنە دەست ناپاكان...
لاوێن جەمەدانی ل سەرسەری ب گەریا هشك و تێهنی دگرنە ڤێری : بلا
گوللێن هەوە بهێنە ئاراستەكرن بۆ سەرێ دوژمنی و ببنە پەند بۆ رۆژگاری،
هەوار و ڤیژیا دایك و خوشكان دچوو بەرعەسمانی ، تەرمێ دوژمنێن خۆ
دكرنە چەپەر ، دناڤ روناهییا تۆپا و تەقەیا برنۆیان و ڕقڕا تەنتریۆڤا ،
ب ئێك گاڤ خۆ دگەهاندە لەشكرێ شەڕكەرێ خۆ ئەوێ ب شەستیرە
و قونداخ ماویزە رو كچیچاپا شەڕ دكر . هەر چەندە ل دەسپێكا شەڕی
سەركەفتنەكا گەلەك مەزن ب دەستڤەئینا . بەلێ نەمانا فیشەكا و سروشتێ
دەڤەرێ و لەشكرێ ڤەنەقەتیایێ دوژمنی ئەم دوورپێچ كرین و كەتنە سووتن
و تالان و كوشتن و براندنا بێ گونەهان ... ئەڤە و ژ بلی ئاگرتێبەردانا
تەڕوهشكی پشتی تالانكرنێ ، ب لۆریان كەتنە كێشانا پیرو و پەككەفتیێن
خودێ نیاسێن مزگەفتێ ، مال و مندالێن دەست نە كەفتی ژی وەكە كوترە
باریكە ( تڤیرك) ێ بەلاڤە و دەربەدەر و هێلێن لێ تێك چوو ! داپیرا ( ستی)
ژی ئێك بوو ژ ئەوێن دڤی شەڕیدا پارێزیا بچووكێن ( باپیر) ێ كوڕێ
خۆ دكر دەربازكربوون ، نە ئێخستبوونە دەستێ دوژمنی ، ل گوندەكێ خۆ
فرۆشان ، لایێ نیاسەكێ خۆ كو ب ناڤ سەر ب ئەوانڤە بوو ، ستارەكربوون،
پشتی گرتنا نازدارا خودان زارۆكێن ساڤا بووكا وێ ل شوینا .

( باپیر ) ێ کوڕێ وێ ، ل گەل چەند ژنێن دی یێن گوندی و دانە دەست ئەفسەرەکی ، کەس دئاخفتنا وان نەدگەهشت ، ل ڤێ رۆژێ دنیا ب ئێکجاری ل داپیرا ( ستی ) گەهشتە ئێك خەما داگرت کو چەوا ،ب چ ئایین و بیروباوەرەکی ژنا بێ گونەه بێخنە دگرتیخانێدا چنکی زەلامێ وێ خۆ نادەتە دەستێ دوژمنی ؟ ! باشە ، کی دبێژیت کوڕێ وێ نهۆ ساخ مایە ؟

هەمی دەما وەکی مەنجەلا شیرێ بهارێ دکەلی ، روندکێن ب گوڕی دهاتنە خوار ب تایبەتی دەمێ وێنەیێ باپیری دهاتە بەرچاڤ ل رزدەیەکا چیایەکی ب دژواری بریندار بوویە و مرنێ سنگێ خۆ بو ڤەکرییە تەحەم ! جەرگێ دایکێ خراپێ ، چەوا لبەر مرنێ ب وی دەستێ فرشك پێ دای قومەکا ئاڤێ نەدایێ ! ئێڤارییەکێ قازانا زادی ل سەر کوچکی دکەلی ، ئاگرێ سەرگێن و پشکلا ل سەر ئێك ببونەکەلەك ، بایێ ئۆدێ یێ رەش و دوکێلی بوو . بەلێ گەرم بوو . جاجارا شیشکەکادی دئێخستە بن قازانێ ، ب دەستێ راستێ ژی لاندکا نەڤیێ خۆ دهژاند .. چەتۆی سەرێ خۆ دانابوو سەر رانێ چەپێ یێ داپیرا خۆ کو هەمی دەما ژ بەر ئێشانا باهینکێ ( روماتیزم ) درێژی هەبوو، جار جار نویزە یەکا ( دایکێ ئەز مرم ) ژ برسان ژێ دهات . ( بێری ) خوشکا مەزنا زارۆکان ل وی رەخێ ئاگری ، وەکی گولەکا چرمسی یا ئاڤ ژێ هاتییە برین زەروسیس هەلگەریابوو ، جل و بەرگێن دڕیای ل بەربوون، داڤەکا دەزی ژێ کیشابا سەد پنی .

دا کەڤنە خوارێ ، ژ برسا وەکی کڤانی لێهاتبوو ، چاڤێن گەلاوێژی یێن تێکچووی ل شۆڕبا پیرخەنی بوو ، ژ لایەکی ( دایکێ شێڤێ ) ، ژ لایەکی ( دایکێ نانی ) ژ بلی واق واقا دناڤ لاندکێدا . ئەڤە تێکەلی هۆڕینە و لاوژو و پێگوتنا داپیرا بریندارا سالْ ب سەرڤە چووی دبوون و نەخشەیا کارەساتەکا رەش و ب تازی و ترسناك دکێشا . ژ بەر هندێ بیرهاتنێن وێ یێن بووری وەکی شریتا سینەمایێ دهاتنە بەرچاڤان ، ب دەنگەکێ تژی کزگریوك لای لایەیا ساڤایێ خۆ و ب ئاوازەکێ تێکەل دگۆت :

**لای لایێ رۆلْەی من لای لایێ کۆر پەکەی دایێ لۆ خەوت نایێ ؟ !**
**بابی بێ سەرت هیچ دەنگی نایێ خودای هەژاران بەهانام نایێ**
**سووتام و برژام لۆ خەوت نایێ ؟ !**

ژ نشکەکێڤە کەسەك زۆر ل سەرخۆ ، بێ پێژن ، هێدی :

– داپیر تۆ ل مالْی ؟

(چەتۆ ) و ( بێری ) لڤین و هشیار بوون !

– کییە ، جەرگێ داپیرێ ؟

– مێڤانان دحەوینن ؟

– کوڕێ من ، بفەرموون ، میڤان دخۆشتڤینە !

(پیرۆت ) مامۆستایێ گوندی : سەلامو عەلێك

– وە عەلەیکە سەلام ، ... ئای مامۆستایە ! کچێ بێری ، پێش منڤە ، جۆدەلیکێ بۆ مامۆستای بهێنە .

جۆدەلیك شرپ ب عەردی دادا و تۆزێ ئۆدە تژی کر .

مامۆستای گازی چەتۆی کر و ماچی کر ، سێڤێن دگەل خۆ ئینایین کرنه دکۆشا وی دا ، خالەتا ( ستی ) بخێرهاتنەکا گەرم و گوڕ ل مامۆستای کر، حەتا بێژی ئێك دوو شیڤا خۆ تێکر و هەر ئێکی نانەك ل بەر دانا ، ئەو مژوولی خوارنێ بوون و ئەڤەژی کەتنە ئاخفتنێ دگەل ئێك و دوو .

داپیرە ستی : ئەرێ گۆری تەبم چ دەنگ و باسێن خۆش دگەل تە نینن ؟ ب مەرقەدێ حوسینێ غازی ، ژ بەر نازدارێ دایکا زارۆکان وەختە بمرم ! گیان یال جهەکێ قایم ناهێتە دەرێ ! بلا خۆفرۆش و دوژمن دەستی خۆ بوەشینن ، ب وێ زنجیرا ل مالا خودێ من راهەژاندی با ... با... پـ پـ پیر بهێتە ڤە ، شیرێ ڤان مەمکان دێ لێ حەرام کەم ، ب نڤیژا نیڤرۆ ئەگەر دوژمنان نەدە نەبەر گوللەیێن وێ بڕنۆیا ب نانێ زارۆکان هاتییە کڕین !...

مامۆستا : داپیر ، ئەم هەمی ( باپیر ) ین ، کوڕێن ، تەیێن بچووکین ، رۆژەك دێ هێت لبەر چاڤێن تە دێ دەنە دادگەها گەل و سزایێ تاوانێن خۆ دێ پێ هێتەدان ، ئەڤە مللەتە – مللەت ، ژ پیلای قایمترە ، ژ دەریا بێ بن فرەهترە، فریزییە هەر ببڕە شین دبیتە ڤە ! دبێژن لەشکرێ مە سەرکەفت ، پشتی سەرکەفتنێ دێ وەرگرن ، هەما بزانە مزگینیا رزگارییێ بۆ تە هات . هێشتا ئاخفتنا وی د دەڤیدا مابوو هەر دوو لایێن روویێ وی ماچی کرن :

– وەی داپیرا رەق و هشك ، نازدار ژ گرتیخانێ دێ هێتەڤە ؟

دگەل باپیری بۆ ناڤ ماڵ و زارۆکێن خۆ ب سەر بلندی ؟ !

وەی خودێ دەرگەهەکی بۆ مە ڤەکە ، ئاخ .... مەرگێ داپیرێ بۆ کوڕێن جحێلێن خۆ نەفرۆش ییت...

– داپیر ، ل من دەرنگە ، ڤی پێنچ دینارێ بگرە ، تە پێدڤی ب چ هەبیت پێ بکرە ، ڤان سێ دیناران ژی بدە ( سێوێ ) بەلێ نەبێژێ مامۆستای یێن هنارتین، چنکی ژنەکا دەڤ بەردایە ....

– ئای مامۆستا ، کەنگی قەنجیێن تە دێ ل سەر خۆ راکەم ؟

مامۆستا رابوو سەرپێیا ، نە داپیر ، ئەڤە یێ مللەتییە ، کو ب شانازی بۆ هەوە دهنێرن ، باپیر بۆ مللەتی سەرێ خۆ کرییە قوربان ، ل سەرخۆ خاترا خۆ خواست و چوو دەرێ .

سپێدێ حەتاڤ دەرکەفت ، داپیرا ستی خۆ گوهاندە مالا سێوێ :

– ها ، ئەڤە سێ دینار ئەوان بۆ تە هنارتینە .

– هەبیت نەبیت ، کێ هنارتینە بۆ من ؟

– من نەنیاسی .

– مامۆستا پێروت نەبیت ، شەڤا پێشتر لگەل هەوە بوو .

من ژ ژنان گوهـ لێ بوو ، دبێژن گەلەکێ باشە .

ستیێ گوتێ : نە ئەو نینەو ، زڤڕی ماڵ .

سێوێ چوو بۆ ناڤ کۆما ژنان رۆنشت و گوت :

– ب خودێ گەلی خوشکا مامۆستا پیرۆتی شەڤا چوویی حەفت دینار بۆ من هنارتن ، دابچم هندەك تری بکڕم ، گەلەك حەژ ژێ دکەم ، ب خودێ بابێ لێقەومییانە .

هەر د وی دەمیدا دەنگ گەهشتە سەرۆکێ خۆ فرۆشان و ئاکەهداریيا رێکخراوا دوژمنی هاتە کرن . مامۆستا گرێدا و ئێخستە ناڤ پیکەپا کەسك و بۆ باژێڕی بر ، ل وێرێ پشتی سێ شەڤ و سێ رۆژان لێدان ، ڤیان ناڤێ وان کەسان بێژیت ئەوێن پشتەڤانێن شۆرەشگێران و جڤین و کرێتییا پێ بدەت.

بەلێ ئەڤ خۆش مێرە رابوو و گۆتە وان : هەر دێ من کوژن ، بەلێ تۆلا من ب هزاران ژ هەوە دێ هێنە کوشتن !

پشتی دەمەکی شەر هاتە راگرتن و پێشمەرگێن قارەمان بەرەف خێزانێن خو ڤەگەڕیان ، هەر ئێکی زارۆکێ وی لبەر سنگی ، خۆشی و شادیێ سەرانسەری نیشتمانێ ڤەگرت ،بێرەو چەتۆ ل دەرگەهێ حەوشێ ، هەر دەمەکی بۆ لایەکی غارددان و ( سەرکەوت ) ژی ب لوتکان دویڤ دکەفت، چاڤ ل بابێ خۆ دگێڕا کو دەرکەڤێت ، بەلێ مخابن دەمەك بوو نیشتمانا خۆشەویست دناڤ گۆریدا باوەشینك لێ دکر .

## بەردە قارەمان

ل دەستپێکا سەدێ بیستێ چەرخا کێشوەرێ عوسمانی بەرەف لاوازیێ دچوو ، هەر دەمەکی بۆ دەمەکێ دی ئالۆزی پەیدادبوون ، چونکی ستەم و زۆرداریا عوسمانیان ژ سنوورا دەرباز ببوو ، ژ لایەکێ دیڤە دەنگێ زەنگلا باوەریا نەتەوەیی بەرە بەرە دناڤ وەڵاتاندا دەنگڤەددا و گەلێن بن دەست ئاگەهداردکرن و ، ئەو گەلێن کو ل ژێر رژێما عوسمانیان دناڵین ، هیڤیێن وان ئەو بوون کو رۆژەك بهێت لبن وی بارێ گرانێ تێدا دژیان رزگار ببن .

کورد ژی ئێك ژ وان گەلان بوو کو بێهنا وان کورت ببوو ل ژێر فەرمانێن تورکان ، هەردەم هیڤی دخواستن کو چرایەکێ ڕوهنێ ئازادیێ لناڤ ئاخا کوردستانێدا هەلببیت .

هەروەسا ل ساڵا ١٩١٤ ز کارەساتا شەڕێ جیهانیێ ئێکێ دەست پێکر ، وی دیمەنێ ترسناك هێدی هێدی شاپەرێن ڕەشێن خۆ ب سەر هەمی قولاچێن جێهانێدا کیشان ، هەمی لایەك تێکشێلاند ، د ئەنجامێ ڤی شەڕێ خوێناویدا چەرخا فەلەکێ ئینگلیز ب سەر کەفتی گەهاندە ئاخا دلێران کو کوردستانە.

وی دەمی ژی شێخ مەحموودی پایەکا بەرز هەبوو دناڤ کورداندا ، چ ژ لایێ ئایینی ڤە ، چ لایێ نیشتمان پەروەریڤە ، کو وی دڤیا کوردستان یا سەربەخۆبیت ، شێخ مەحموود دڤی دەمیدا یێ شەپرزە و ئاڵوز بوو ، وی ب باشی زانی کو ئینگلیزان ئاگەهدار بکەت کو ئەڤ

ئاخه وەلاتێ كوردانه دڤێت بۆ كوردان بمینیت،ژ بەر هندێ نامەك بۆ نوینەرێ ئینگلیزی هنارت كو ل بەغدابوو ، دناما خوٚدا گوتبوو:
ب سەدەهان سالە ئەڤ ئاخه مەلبەندێ كوردانه و هیڤیدارین كو هوین مافێ مه بدەنەمه و ، وی مافی نەدە نەمه كو پاشی بچەكی ئەم داخوازا مافێ خوٚ بكەین. پشتی ئینگلیزان هزر دڤێ چەندێدا كری گوت ئەم دێ مافێ كوردان دەینێ، پاشی لسەر ڤێ پەیمانێ نوینەرێ ئینگلیزی ( مێجەر نوئێل ) بێ ی ئالوٚزی و ئاستەنگ گەهشته سولەیمانیێ ، بوٚ روٚژا پاشتر لبەر دەرگەهێ ( سەرایا سولەیمانیێ ) ل پێش چاڤێن هزاران ئاكنجیێن باژێڕی چوو سەر كورسیەكێ هەر زوو گوت : (( بناڤێ میرێ بەریتانیا حاكمێ گشتی یێ عیراقێ ئەم هەوە ئاگەهداردكەین كو هوین یێ ژ ئێخسیریێ و گرتنێ ڕزگار بووین ، ئێدی هوین دسەربەست و ئازادن ، شێخ مەحموود حاكمدارێ كوردستانێ یە ))
ب كەیف خوشیا ڤێ مزگینیا خوٚش ، گەلێ كورد وەكی گولێ گەش بوو ، باژێڕێ هەلەت و قوربانیێ بوویە پارچەیەك ژ بەهشتا بەرین لێ هزار مخابن! ئەڤ خوٚشی و شادیە گەلەك ڤەنەكیشا !! چونكی ئینگلیزان ژ نیڤا دلێ خوٚ باوەری ب مافێ كوردان نەبوو . بەلكی بو خوٚ بنەجهكرنێ ئەڤ ئاخفتنە گوت بوو !! بڤی ڕەنگی ب تەمامەتی ژ ئاخفتنێن خو لێڤەبوو ، دەست دا ب ئینانا بیانیان ژ دەرڤە بوٚ ناڤ ئاخا كوردستانێ و دوور ئێخستنا هندەك كوردان ، ئها بڤی ڕەنگی بارێ كوردستانێ روٚژ ب روٚژ ئالوٚز تر د بوو ،

هەتا گەهشتیە وێ ڕادێ شێخی ئاگەهـ لێ نەدما ، شییان و ووزەیا وی نەمان کو کاودانێ وەلاتی بڤی شێوەی ڕابگریت ، ئەڤجا نامەکا توندوتیژ بو دادوەرێ گشتی یێ عیراقێ هنارت و داخوازا بجهئینانا پەیمانا وی ژێ کر ، کوسەربەخۆیا کوردانە ، ئەڤ داخوازییە ژی یا بێ مفا بوو ، چونکی ئینگلیز ب تەمامی ژ وێ سۆزێ پەشێمان ببوون ئەوا وان دایێ ، ڤێجا شێخی دەست دا خۆ ئامادەکرنێ ژ بۆ دەرئێخستنا بیانیان ژ ئاخا کوردستانێ، ئیدی ئاگرێ شەڕی هەلبوو ، سیار و پەیادەیێن کوردان وەکی پڵنگان ژ هەمی لایەکیڤە هێرش دبرنە سەر سەنگەر و چەپەرێن دوژمنی ، ب ڕاستی کریارەکا وەسا وان ئەنجامدا کو چ دەما نەهێتەکرن ، تاسلوجە ببوو گوڕستانا سوپایێ لێڤی یێ ئینگلیز ، پشتی ڤێ سەرکەفتنا مەزن سوپایێ کوردان ل ژێر سەرکردایەتیا حوکمدارێ کوردستانێ بەرەف کەرکووکێ چوون ، ل دەربەندێ بازیان بارەگایێ خۆ دانا ، هەر وەسا ئینگلیزان ژی هێزەکا مەزن ژ موسلێ بۆ کەرکووکێ ئینا ، پاشی ئەڤ هێزە بەرەف بازیان لڤی .

بڤی رەنگی ددەمەکیدا دگەل بەیانا سپێدێ سوپای ئینگلیزی ژ چەند لایەکا ڤە هێرش برنە سەر شەرکەرێن دلێرێن کوردان ب گرانترین چەکێ کوژەك ل ئەردو ئەسمانان .

سوپایێ کوردان ژی وەکی شێران بەرهنگاری وان بوون و شەڕەکێ مەردانە کر هەتا وەلێ هاتی رێزێن پێشیێ یێن سوپایێ کوردان دەست بدەنە

خەنجەران و هێرش دکرنە سەر دوژمنی و بناڤ کەتن ، ئیدی هەر ئەو بوو کو کەس ب زیندی نەڤەگڕیان ، پشتی شەڕەکێ دژوار و بێ وێنە شێخ مەحموود بریندار بوو ، ژ ئەنجامێ ڤی شەڕێ دژوار سوپایێ کوردان شکەست و دوژمن هاتە ناڤ بارەگایێن واندا ب دەسنیشانا کوردەکێ بێ بها شێخ ب برینداری ل بن بەرەکی نیشا ئینگلیزان دا ، ب ئێخسیری برە بەغدا و شەڕ ب دوماهی هات ، ئەو بەر ببوو چەپەرەك بو پاراستنا شێخ مەحموودی د دەمێ شەڕێدا و ناڤێ وی بەری کرە ( بەردە قارەمان ) ، ئەڤ بەرە دکەڤیتە ژێریا دەربەندێ ، باشی ناڤێ ڤی بەری بەلاڤەبوو ، ل سەر زارێ هەر نیشتمان پەروەرەکێ کورد و ناڤی وی ب پیروزی لناڤ لاپەڕێن مێژوویا ب خوین یا گەلێ کورد هاتە تۆمارکرن ، بەرێ ناڤبریژی هەر ب وێ هیڤیێ یە کو تۆڤێ دوو بەرەکیێ و خۆ فرۆشیێ و نا پەسەندیێ ژ ڕەه و ڕیشالان ژ ناڤ کوردان بهێتە هەلکێشان، هەر وەسا هاتییەگوتن: چ جاران پشتا خۆ ب بیانیان ڕاستنەکەن .

# دهۆك

## دهۆك د دیرۆكێدا :-

بێ گومانه كو دهۆك ژ باژێرین كەڤنێن كوردستانا عیراقیێیه ، پرۆفیسۆر ( فۆر ) دبێژیت : ل دەمێ ئاشووریاندا دهۆك بناڤێ ( ئەدیان ) ناڤ و دەنگێن وێ بەلاڤه بوویه ، چونكی پایتەختێ هەرێما دیموزا ئاشووری كو نێزیكی ( بیت داكان ) بوو ، گومان تێدانینه دهۆك جهەكێ گرنگ و ب بها بوو لنك ئاشووریان ، چونكی سەرێ رێكا سێ دەربەندا چیایی بوو ، ( دەربەندا دهۆكێ و دەربەندا قەشەفرێ و دەربەندا دەرگەلا شێخان ) ، هەمی هاتو چوویێن ئاشووریا دگەل دەولەتا ئورتوو ولاتێ حسییان دڤان سێ دەربەندا دا بوو ، لەورا دهۆك ئێك ژ باژێرێن كەڤنێن كوردستانێ یه ، بەلێ دێ ب چ هێتەزانین كو كەڤنه باژێره ؟ ب پەیكەر و وێنەیێن دا تراشیێن شكەفتێن دەورووپشتێن وێ ، دگەل وان گۆڕێن كەڤن یێن هەتا نوكه دڤان شكەفتاندا ماینه ، ژ بلی وێ چەندێ ژی دەڤەرەكا گرنگا میرنشینا داسنیێن زێری بوو، ئەو میرنشینا بەری سالا ( ٩٦١ ) ی زایینی هاتیه دامەزراندن هەتا سالا ( ١٢٣٦ ) ی زایینی ژ كار و دەستهەلاتدار و فەرمانڕەوا بوو ،میرنشینا داسنیان كو یا بێ هێز و هەژار بوو ، میرنشینا شێخان ل جهێ وێ هاتە دامەزراندن ، بەلێ پشتی دەمەكێ كێم بوویه پارچەیەك ژ میرنشینا بەهدینان، كو هەتا سالا ١٨٤٣ ) ی زایینی دەسهەلاتداری ل هەرێما بەهدینان دكر ، دیرۆكنڤیسێ ب ناڤ و دەنگ ( هارتمان ) دبێژیت : -

ل دەم و جهێ فەرمانڕەوایا ( تاسیوس بیزاسیوس ) دا

دهۆك بناڤێ ( جا هۆك ) هاتیە ناڤكرن ، چونكی هەتا نوكە ل شكەفتا هەلامەتان ل چیایێ شندۆخا بەرامبەری گوندێ ( گەڤەرکێ ) پەیکەر و وێنەیێ بەرێ هەلکولای ب روویێ چیایڤە مایە ، وێنەیەك ژ وێنەیێن هەلکولای یێن شکەفتێ وێنەیێ پاشایێ ئاشووری ( ئەرد نەرێری ) یە .

دیرۆك نڤیسێ کوردێ بناڤ و دەنگ ( حوسێن حوزنی موکریانی ) دبێژیت: ئەگەرێ ناڤ لێنانا باژێری ب ( دهۆك ) ئەوە ، کو پاشای یان میرێ نیڤ سەدێ چوارێ زایینیدا ، کو ناڤێ وی ( ئاخ شندۆ ) بوویە ، هەر تشتێ ژ دەخل و دانی یان بەرهەمێ دی یێ چاندنێ هاتبا وێرێ ئانکو ( دهۆك ) ێ دوو مستا ژ وی متای دا ژێ ڕاکەن ، بەلێ هارتمان دبێژیت :

( ئاخشندۆ ) میرنشین بوویە ل سەدەی دووێ زایینی ل شندۆخا . لڤێ دوماهیێ پاشمایێ گرنگ و ب بها ل گوندێ ( مالتایێ ) کو نزیك باژێرێ دهۆکێ هاتیە دیتن .

باژێرێ دهۆکێ د دۆڵەکێدایە دناڤبەرا ڕزدا چیایێ درێژێ سپی ژ لایێ باکووریڤە ، چیایێ شندۆخا ژ لایێ باشووریڤە ، ئەڤ دۆڵا کو باژێرێ دهۆکێ تێدا هاتیە دروستکرن ، دوو ڕووبار ڤی باژێری ئاڤەدان دکەن :

یێ ئێکێ ( ڕووبارێ دهۆك ) یێە کو ل سەرێ ژووری ئانکو سەرێ باژێری بەرەف باشوورێ ڕۆژ ئاڤا دەرباز دبیت ، یێ دووێ ( ڕووبارێ هشکە ڕوو ) یە کو یێ بچوو کترە ژ یێ ئێکێ ل ژێریا باژێری بەرەف باشوورێ ڕۆژ ئاڤا دەرباز دبیت و دگەهیتە ڕووبارێ دهۆکێ ل ڕۆژئاڤایا دۆڵێ .

دهۆك وەکی نیمچەدورگەیە کو کەفتیە دناڤبەرا هەر دوو رووباراندا، ب ئاڤا هەردوو ڕووباران باخ وبیستان ورەزێن دەورروبەرێن باژێری

پێ دهێنه ئاڤدان ، فێقیەکێ بژاره و ڕەز و باخێن وێ بناڤ و دەنگن. هژمارەکا زۆر ژ ئاکنجیێن وێ خوشیێ پێ دبەن .

پشتی ڕێکا دناڤبەرا موسل و ئامێدیێ هاتیه ڤیرکرن کو د دهۆکێدا دەربازدبیت . دهۆك کەفتیه سەر سێڕیانا بازرگانی دناڤبەرا قەزایێن کوردی یێن دەڤەرا بەهدینان و موسل و هەڤلێرێ ژی ، ژ بەر هندێ دهۆك یا بەرەف پێشکەفتن و ئاڤەدانبوونێ دچیت ، نەخاسمە گرنگی پێدان ب هاڤینگەهێن دەڤەرا بەهدینان وەکی ( زاویته ، سیاراتیکا ، سەرسنگ ، سۆلاڤ ، ئەرەدنا، بامەرنێ ... ) پشتی ل سەر داخوازیا بزاڤا رزگاریخوازا مللەتێ کوردی ل ١٩٦٩/٥/٢٩ حکومەتا عیراقێ بڕیار دای دهۆك ببیته پارێزگەهـ ، ل ڤان سالێن دوماهیێ ب تایبەت پشتی سەرهەلدانا مللەتێ کورد ل بهارا سالا ١٩٩١ ز بازێڕێ دهۆکێ ئاڤەدانیەکا مەزن ژ هەمی لایان ڤە بخۆڤە دیتیه و پاشە ڕۆژەکا ڕووناك هەیه ، چونکو دێ بیته دەڤەرەکا بازرگانی و زانست و پێشەسازی یێ ل بەهدینان .

## ئافرەتا كورد

دمێژوویا ژیانا كوردەواریدا ئافرەتێ پایەكا بلندا جڤاكی هەیە ، نەخاسمە ئەگەر سەحكەینە كریارێن ب هێزو بلندێن ئافرەتا كورد دێ بینین :
دلێ وێ زۆر ب مێرو ماڵ و زارۆكێن وێ خوشە ، لەوا یا هەڤپشكە دگەل زەلامێ خۆ دخۆشی و تەنگاڤیاندا ، بڤێ چەندێ بۆمە دەردكەڤیت كو ژنێن كورد هەتا چ رادەیەكێ دەست رەنگینن ل ماڵ و پەروەردەكرنا زارۆكان و هاریكاریكرنا هەڤسی ، كا چەوا خزمەتا مێڤانان دكەت ، دەمێ زەلامێ وێ ل ماڵ نەبیت ، گەلەك جاران بڤێ ژی رازی نابن ، بەلكی یا مژیلی كارێ رستن و چنینێ و دروست كرنا ماست و پەنیر و ژاژی و دەوی و نیڤشكی و فری یە ، بو مفایێ خێزانێ و بو فرۆشتنێ ، ژ لایەكێ دیڤە مل بملێ زەلامێ خۆ ل چیا ، بو دیڤ گوریانا (كەزوان و بەروو ، مازی چنینێ) یان ژی مژیلی باركرنێ و بەر ئاڤێ و تووتن چاندنێ و رەز و باخ و ئاڤدانێ یە، و خودانكرنا تەرش و كەواڵی یە و ، داربرین و كرین و فرۆشتنێ ل گەل زەلامێ خۆ ، و هاریكاریا وێ ل كارگەهـ و زەڤیان دكەت ، ئەوا هەژی گوتنێ لڤێرە جوانیا ئافرەتا كوردە ، كو جوانیە كە خودێ پێدایە ، بێی خەملاندن و نیشان و نەخش و نیگارە ، سەر و سیمایێ وان دسوور و سپی و گەنم رەنگن ، دەمێ دبینی دهەستی سڤك و خوین شرینن ، پرچێ وان یێ رەشە یان زێرینە ، ژ بو پێدڤی یا ژیانێ سیاری دەواران دبن و ، لناڤ مێرگ و چیمەن و دارستانان دگەرێن ، لەورا سیارچاك و تڤەنگ خۆشن ، د خوشیاندا داوەت و شەهیانا و رەشبەلەكێ دكەن ، و

سەربەخۆیەکا تەمام هەیە ، ل هندەك جها نەبیت ، دبارێ شوکرنێدا ، دلداری و ئەڤینیەکا پاقژ دزانن ، بو هندێ داشوو پێ بکەن و د دەهمەن پاقژن ، دڤی باریدا ئێك ژ نڤیسەرێن بیانی کو ( جانترە ) دبێژیت : دەهمەن پیسی دناڤ کوچەرێن کورد دا نینە ، بەلکو کێم جارا ئەڤ رەوشتە دهێتە دیتن .

هەر وەسا ( میجەر سۆن) و ( میستەر ریج ) کو هەر دوو رۆژهەلاتناسێن ئینگلیزن دڤی باریدا دبێژن : ( نەتەوێ کورد ئێکەم نەتەوەیە ل رۆژهەلاتی کو دەهمەن پاقژیا ئافرەتا خۆ پاراستییە ) .

ل گەلەك دەماژی ئافرەتا کورد ب زیرەکی و هێز و شیان دیار کرییە . رێڤەبەری و دەستهەلاتداری دایە دەستێ وێ ، ژ بو خودێ نیاسین و چاکیێ و نیشتمان پەروەریێ و زانینێ و هونەرمەندیێ و دل تەڕیێ ژ زەڵامی یا کێمتر نەبوو ، بۆ نموونە وەکی ( خاتوون خانزاد – میرا سۆران ) کو شاژنەکا ئازا و بجەرگ بوو د شەڕاندا . یا زانا و جوامێر و دادپەروەر بوو ، هەردەم خەبات کرییە ژ بو ئاڤەدانکرنا وەڵاتی ، ژ ڤەکرنا گەلەك قوتابخانا و مزگەفت و نەخۆشخانان ، چ جارا رێکا بن دەستیێ و سەرشوورِیێ نەدایە دوژمنی ، بەلێ ( قەدەم خێر ) و ( قەرە فاتم ) ، دوو نموونێن خەباتکەرێن ئافرەتێن زیرەك و چاڤ نەترس و بناڤ و دەنگێن کوردستانا ژووری و کوردستانا رۆژهەلات بوون .

هەروەسا ( حەپسە خانا نەقیب ) سەرکردەیا ڕاستەقینە یا هەمی ئافرەتێن سولەیمانیێ بوو ژ لایێ جڤاکیڤە و ، ژ باشی و کورد پەروەری و مرۆڤایەتییێدا، گەلەك سەرۆك و زەلامێن ناڤدار ڕاو بو چوونێن وێ وەرگرتینە و پرسیار ژی کرینە ، ل ساڵا ( ١٩٣٠ )ز نامەك دەربارەی مافێ نەتەوەیێ کورد بۆ ( جڤاکێ گەلان ) هنارتیە و هەر د ڤێ سالێدا ژی ( کۆمەڵا ژنان ) ل

سولەیمانییێ دامەزراند. هەمی پاڵدان بۆ خواندنێ و تێگەهشتنێ و کاروبارێن کوردایەتییێ ، ژ بلی ڤێ چەندێ دهەمی بیاڤاندا هاندانا ئافرەتێن سولەیمانییێ دکر ژ بو کریارێن باش ، وەکی دەست گرتنا یێن هەوجە و پێدڤي و هاریکاریا هەژاران و رێزگرتنا زانایان ب شێوەکێ رێك و پێك ، رەوشتەکێ پاقژ و بلندێ ئافرەتێن کورد نیشا بیانیان ددا ل دەمێ چوونا وان بۆ بازێرێ سولەیمانییێ .

هەر دیسان نموونەکا دی یا ئافرەتا رەوشەنبیرا کورد :

( رەوشەن بەدرخان ) کو خێزانا ( جەلادەت بەدرخان ) ە ، بو پێشکەفتنا ئەدەب و تورێ کوردی و بەلاڤەکرنا گیانێ کوردایەتییێ خەبات کریـیە .

نهو ژی نموونەکا جوانیا ئافرەتا زانا و زیرەك و سەربلند و نیشتمان پەروەرا کوردە دناڤ کوردێن رۆژئاڤادا .

ڤێجا ئەڤە نموونەیەیێن رابەرێن دلسۆزیا ئافرەتێن کوردستانێ بوون ، هەلگرێ چرایێ رێکا سەربەستییێ و رزگاریا قوناغا نەتەوەیێ بوون ، هەمی بزاڤ و خەباتا وان بو ئافرەتێن ئەڤرو یێن کوردستانێ ئەو بوو : کو ئەرکێ فەرێ ل سەرملێن وان ، و ب وی پەرێ ئازایەتییێ و دلسۆزییێ و خوگوریکرنێ ، مل ب ملێ برایێن خویێن خەباتکەر و زاناو رەوشەنبیر خەباتێ بکەن ، ژ بۆ ب دەستڤەئینانا مافێن رەوایێن کورد و کوردستانێ ، وێ جارێ دێ شیێن بێژین هوین ب ڕاستی جهێ شانازی و سەربلندیا مللەتینە و پەروەردکارێن ئاڤا زەلال و بایێ فێنك و ئاخا جوانا پڕ بەرهەما کوردستانێنە .

# میدیا

میدیا کوردی ب گشتی وتێلەفزیونێن ئاسمانی ب تایبەتی کاریگەریەکا بنەڕەتی ل سەر زمان و ناسنامەیا کوردی د دانن . کەنالێن تێلەفزیونی یێن ئاسمانی هەتا (٢٠) سالان بەری نوکە تنێ د دەستێ دەولەتا نەتەوەیدا بوون و د خەونا هیچ کوردەکیدا نەبوو کو کورد بیتە خودانێ کەنالەکێ راگەهاندنێ یێ سەربەخۆ, لێ ئەڤرۆ تێلەفزیونێن کوردی راستیەکن ل کوردستان وجیهانێدا وهەمان رۆلێ تێلەفزیونا نەتەوەیی یان دەولەتی بو کوردان دگێڕن . سەردەمێ نوکە دبیاڤێ میدیایێدا بو کوردان وەك سەردەمەکێ گەهشتنا کوردانە ب ئاسمانی د سەردەمەکێ ب جیهانبوونێ بهێتە نیاسین ئێك ژ ئەنجامێن پروسێسا میدیا جیهانبوون ژی ئەو بوویە کو ب رێکا تێلەفزیونێن ئاسمانی , هشیاریا نەتەوەیی بهێزتر بیت , هەر وەسا زمان وناسنامەیا کوردی پتر بهێتە چەسپاندن. تێلەفزیونا ئاسمانی یا ئێکێ , مید تیڤی بوو کول رۆژا (١٥) ی هەیڤا گولانا (١٩٩٥) ل لەندەن بو جارا ئێکێ د مێژوویا کورداندا ب شێوەیەکێ بەردەوام دەست ب وەشانێ کر وهەتا رۆژا (٢٢) ی هەیڤا گولانا (١٩٩٩) بەردەوام بوو . کوردستان تیڤی ل هەیڤا کانونا دووێ سالا (١٩٩٩) دە ستپێکر . ل سالا (٢٠٠٠) ز ولدویڤدا کۆمەلەکا تێلەفزیونێن ئاسمانی یێن دی یێن کوردی , وەك : (رۆژ , زاگرۆس , کوردسات , میزوپۆتامیا , نەورۆز, گەلی کوردستان کەی ئێن ئێن , نووچە , ستێرك ...) دەست ب وەشانێ کرن . ئەڤرو تێگەهێ ب جیهانبوونێ تێگە هەکێ جهگرتیێ ئەکادیمییە

ودناڤ دەنگ وباسێن سیاسی ئابووری کۆمەلایەتی و کولتوریدا وەك تێرمەکێ ناسیارێ ژ هەژیێە , ب جیهانپوون ژ ئاسمانی نەهاتیە خوارێ , ژ پاشخانەکا درێژا مودێرن سەرهلدایە . ل سنورێ ب جیهانبوون تنێ بەحسێ سنورێ ئاخ و جوگرافێ ناهێتە کرن , بەلکی بەحسێ سنورێ کۆمەلایەتی وکولتوری... دهێتە کرن . لێ تایبەتمەندیەك , کو هەمی جۆرێ سنورێن سەردەمێ ب جیهانبوون نێزیکی ئێك دکەت , ئەوە کو هەمی پەیوەندیێن کۆمەلایەتی یێن مرۆڤی دهێنە گوهۆڕین . تەکنەلوژی و ئامیرێن پەیوەندی و ڕاگەهاندنێ ل سەردەمێ ب جیهانبوون شوینوا رەکێ زۆر مەزن ل سەر لاوازکرن یان بەروڤاژی موکمکرنا سنوران دانایە . بۆنموونە بهێزبوونا هەستێ نەتەوەیێ لنك کوردان ب رێکا میدیێ وئامیرێن ڕاگەهاندنێ بهێزبوو . هەکە هەتا دووهی بۆ نموونە سنور رێگر بوو ل چوونا کتێب و بەلاڤەکرنا کوردی ژ باشووری بو رۆژ هەلاتا کوردستانێ , ئەڤرو هەمان سنور ب رێکا تێلەفزیونا ئاسمانی وئێنتەرنێتن هاتینە ژێبرن و کێشك پشکا کوردستانێ بیت ، جیاوازیێ ناکەت , ب رێکا ئاسمانی وئێنتەرنێتن د چالاکیێن کولتوري یێن ئێکدوو وئاگەهدارن , ئەوی دبوریدا بۆ دەمێ چەند رۆژەکان و هەتا چەند هەیڤەکان بۆ بەلاڤەکرنا دەنگ وباسەکی دناڤ کوردااندا بێدڤی بوو , ئەڤرو هەر ئەو دەنگ و باس د چرکەکێدا ل هەمی جیهێن کوردستانێ ودەرڤەی کوردستانێ بەلاڤە دبیت . تێلەفزیون وەك ئێك ژ کەرەستێن ڕاگەهاندنێ , دشێت کارەکی بکەت , کو میدیا زویتر وپتر تێکەلی ژیانا کۆمەلایەتیا مرۆڤان بن , ئەم دشێین بێژین ب ڕێکا میدیایێ مرۆڤی پەیوەندی دگەل ئێك دکرن هەر چەندە ل جه و دەمێن جیاوازدا دژین

تێلەفزیون دبیتە خودیکا نەتەوەیی کو ژن و زەلام وپیرو لاو وپێشکەفتیێ وپاشکەفتی خۆ وناسنامەیا خۆ تێدا دبینیت . وەك دهێتە گوتن زمان بەرێ بنیاتێ ناسنامەیێ پێك دئینیت، مەرەم تنێ زمانێ نڤیسن و ئاخڤتن و زاراڤێن کوردی نینە , بە لکی مەرەم ئەو زمانێ کەلتوری یان چڤاکێ کولتوریە کو ب رێکا کاریگەریا تێلەفزیونێن کوردی لنك بینەرێ کورد جهێ خو دبینیت.

گوڤارا کۆنفرانسێ سالانەیێ زمانێ کوردی ٢٠١٢
نەتەوەیك ل ئاسمانی سیاوەش کۆدەرزی

## ڕاڤەکرنا پەیڤان

| پەیڤ | رامانا وێ |
|---|---|
| میدیا | راگەهاندن |
| وەشان کر | بەلاڤەکر |
| ئەکادیمی | زانستی |
| تێرم | زاراڤ |
| کەلتور | رەشەنبیری |
| کۆمەڵ | جڤاك |

# ( پێڕست )

## ( پێڕست )

## ( پێڕست )

## ( پێرست )

## ( پێڕست )